## جەلال میرزاکەریم

جەلالی میرزا کەریم (1937-1993) دەنگێکی دیاری شیعری کوردی بوو، بەتایبەتی لە نیوەی یەکەمی حەفتاکاندا. لەو ماوەیەدا جەلال ژمارەیەك قەسیدەی هونەری دانسقەی بڵاوکردەوە، لەو قەسیدانەدا بابەتە سیاسی و کێشەکانی ڕۆژی لە بۆتەی شیعریەتدا تواندبووەو بەمەش ئەو ڕێچکە شیعرییەی گەیاندە چڵەپۆپە کە لە سەرەتای شیعر نووسینەوە هەڵیبژاردبوو.

سیاسەت هەمیشە شیعر لە ڕاستەوخۆیی نزیك دەکاتەوە، جەلال دەرکی بەو ترسەی سیاسەت کردبوو، بۆیە هەوڵی دەدا مەبەستە سیاسییەکان لە ڕێی وێنەی شیعریی و ئەندێشەی چڕدا دەربڕێ، بەمەش هەم خیانەتی لە قەناعەتی خۆی نەکرد و دواجاریش وەکو شاعیرێك دەنگی بیسترا کە ئەوەیان گرەو بردنەوەیە و هەموو جارێك وا هەڵناکەوێ.

جەلال لە سەرەتای حەفتاوە لەگەڵ هاوڕێکانی (حسین عارف، شێرکۆ بێکەس، کاکە مەم بۆتانی، جەمال شارباژێڕی) بانگەوازی ڕوانگەی ئیمزاکرد. ئەو بانگەوازە بۆ نوێخوازی، هەوڵدانبوو بۆ دەرچوون لە چوارچێوە تەقلیدییەکانی زمان و دەربڕین. ئەو بانگەوازە نێوەندی ئەدەبی و ڕووناکبیری کوردی بە جیاوازی بیروبۆچوونەوە ورووژاندو دایالۆگێکی ئەدەبی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا هێنایەکایەوە. گرنگی (ڕوانگە) لە گرنگی مێژوویی خۆیدایەتی، لە دەرککردندا بەوەی کە گوڕو تینێکی تازە بکرێ بەبەرجەستەی شیعر و ئەدەبی کوردیدا یا شڵەقاندنی گۆمێك لەو قۆناغەدا.

یەکێك لەو ئەدیب و ڕووناکبیرانەی ئەو سەردەمە و یەکێك لەو کەسانەی لەو بزووتنەوە نوێخوازیەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو جەلال میرزا کەریم بوو، بەتایبەتیش ئەو کاتە لە بەغدا دەژیا، لەو ماوەیەدا بەغدا ببوە پایتەختێکی ڕۆشنبیریی، بەهۆی جموجوڵی ئەدەبی و هونەرییەوە، جەلال -یش چونکە لە دونیای ڕۆژنامە نووسیدا کاری دەکرد، توانیبووی ئەو زەمینەیە بقۆزێتەوەو دەنگی خۆیان بەشێوەیەکی خێراتر بگەیەنێ.

جەلال بە درێژایی تەمەنی هەمیشە لەگەڵ میللەتەکەی خۆیبووە، شیعرەکانی دەربڕی ئازارەکانی کوردبووە، تا دواجاریش کە لە کوردستان دوورکەوتەوەو چووە کیشوەری دووری ئەمەریکا هەمیشە دڵی لای میللەتەکەی بووە، لەو ماوەیەدا کەم تا زۆر و سەرەڕای نەخۆشی هەوڵی داوە خزمەتی جموجۆڵە سیاسی و ئەدەبییەکان بکا کە تایبەت بوون بە کورد لە ئەمەریکاو ئەوروپاو دیوانێکی خۆشی لەوێ چاپبکات کە زۆربەی شیعرەکان لە ئاقاری غەریبی بۆ وڵات و خەبات و هەڵسانەوە دەخولێنەوە.

جەلال میرزا کەریم دوای حەڤدە ساڵ غەریبی چەشنی هەورێکی سپی بەسەر گۆچانێکی دارگوێزەوە گەڕایەوە کوردستان و بەدیداری میللەتەکەی و نیشتمانەکەی شادبووەوە. بەداخەوە مەرگ ڕێگەی نەدا ماوەیەکی زۆر لامان بمێنێتەوە و لە بەرەبەیانی 1993/1/14 دا بۆ یەکجاری ماڵئاواییلێکردین.


دەستەی ڕاوێژکاران
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەرێوەبەری ڕۆڤار
دڵشاد عەبدوڵڵ

سکرتێری رۆڤار
عەتا قەرەداخی

سەرپەرشتی هونەری
قادر میرخان

کارگێڕان
تاهیر سالح سعید
عوسمان شەیدا
ئاکۆ کەریم

مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید حمەخان



(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك
دەری دەکات



ناونیشان
سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
ڕۆڤار
ت / 2120690
لەدەرەوەی کوردستان
Tel: 0044162846008
Fax: 00441628477660



چاپخانەی (ڕەنج)




**شیروان توفیق**:

- ساڵی 1966 لە سلێمانی لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1982 دەستی بەکاری هونەری کردووە.
- ئێستا بەرپرسی بەشی هونەری دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمە.

# بیبلۆگرافیای ژیانو بەرهەمەکانی جەلالی میرزا کەریم

جەلالی میرزا کەریم لەساڵی 1937 لەشاری سلێمانی لەخێزانێکی ناوداری ئەم شارە هاتۆتە دنیاوە. بنەماڵەکەیان پێشتر لەقەڵاچوالان بوونو لەگەڵ دروستکردنی شاری سلێمانیو کردنی بەپایتەختی میرنشینی بابان ئـەمانیش لەگـەڵ چـەندین بنەماڵـەی تـرو دامودەزگـای مـیردا گواسـتویانەتەوە بـۆ پایتەختی نوێ.

جەلال لەئامێزی خێزانێکی دیارو خانەدانی سـلێمانیدا پـەروەردە بـووەو هـەر لـە ڕەگو ڕیشەوە گیانی نیشتمانپەروەریو کوردایەتیو ئـازادیو خۆشەویستی خـەڵکی لەسـنووری پەروەردەی خێزانیدا مێشكو چاوو گوێچکـەو زمـانی جـەلالی کردۆتـەوە. کـاتێکیش قۆنـاغی منداڵـی بـەجێ دەهێڵێـت بەکاریگـەری ئـەو پـەروەردە کردنـە ڕێگـای ڕاسـتی خـۆی دەدۆزێتـەوە کـەڕێگای خـەباتو تێکۆشـانە لەپێناوی ئازادیو سەربەستیدا.

سەرەتای خەباتی جەلال لەڕیزی قوتابیاندا دەست پێدەکاتو لەساڵی 1955 دەبێتە ئەندامی یـەکێتی گشـتی قوتابیـانی عـێراق کەئـەم ڕێکخراوە سەر بەحیزبی شیوعی عـێراق بـوو. هەر لەو قۆناغەشدا دەست دەداتە خوێندنەوەو سـەرەتای شـیعر نووسینیشـی لـەوێوە دەسـت پێدەکـات، ئەگـەرچی ئـەو شیعرانەی سەرەتای بەلاوە ناوەو هیچیانی بڵاونەکردۆتەوە.

لەهێنانـەوەی تـەرمی شێخ مـەحمودی حـەفیددا واتـە سـاڵی 1956 هـەموو شاری سلێمانی خرۆشا، بەتایبەتی کاتێ کەشێخ لەتیفی کوڕی لەبەندیخانەی سلێمانی بوو حکومەت ڕێگای نەدەدا شێخ لەتیف بەشداری بەخاك سپاردنو پرسەی باوکی بکات. جەلالی میرزا کەریم یـەکێك لەولاوە خوێن گەرمانە بوو کـەدەوری کاریگـەرو لەبـەرچاویان هـەبوو لـەو خۆپیشـاندانەداو لەئـەنجامی ئەوەدا کاربەدەستانی حکومەت ژمارەیەکی زۆر خەڵکیان لەسلێمانی دەستگیر کرد کەیەکێك لەوانە جەلالی میرزا کەریم بوو، پاشان لەدادگای عورفی سزای سێ مانگ زیندانیو ساڵێك مانەوە لەژێر چاودێری درابەسەردا.

هـەر لەسـاڵی 1956 جـەلالی مـیرزا کـەریم سـەرباری ئـەندامێتی لەیـەکێتی قوتابیانی گشتیدا. پەیوەستبوونی خۆیی بەمەسەلەی نەتەوایەتی کوردەوە ئاشکرا کردووە بەتایبەتی لەو شیعرەیدا کە بەبۆنەی 19ی حوزەیرانـەوە بـۆ چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی کوردستانی داناوە.

دوای چواردەی تـەموزی 1958و ڕوخـاندنی ڕژێـمی پاشایەتی جەلالی مـیرزا کـەریم ئارەزووی خـەریك بوون بەڕۆژنامەگەری لای سـەری هـەڵداو ئـەوە بـوو لەساڵی 1959دا لەگـەڵ عـەبدوڵای بابا عـەلی دەستیان دایە دەرکردنی گۆڤـاری "هیـوای کوردسـتان" کـە ئۆرگـانی یـەکێتی گشـتی قوتابیـانی عـێراق لقـی سلێمانی بوو.

لەساڵی 1960دا کتێبی "چۆن دەبی بەتێکۆشـەرێکی تـەواو" لەنووسـینی لیوشاوسی کرد بەکوردی. ساڵانی شەستەکان کەقۆناغێکی هێجگار ناجێگیر بـوو لـەمێژووی کوردسـتانو عێراقیشـداو لـەرووی ڕۆشنبیریشـەوە تـادوا ساڵەکانی ئـەم (دەیـە) جۆرێـك لـەتاریکی بـاڵی بەسـەر نێوەنـدی ئـەدەبیو ڕۆشنبیری کوردیدا کێشا بوو، جەلالیش سەرباری زیندانی کردن، بەڵام هـەر هـەمان شـێوەی زۆربـەی ڕۆشـنبیرانی تـری میللەتەکـەی لـەنێوان هـەڵچوونو داچوونی سیاسەتو ڕوداوەکاندا بووەو وەکو خۆیشی دەڵێت نیوەی دووەمی شەسـتەکان ئـەو قۆناغەیـە کـەتیایدا ژیـانی ڕۆشـنبیری ئـەو بەشـێوەیەکی لەبەرچاو دەست پێدەکات



جـەلال لەسـاڵی 1962 لەسـەر چالاکی سیاسـی بەربلاوی دەگیرێتو دوو ساڵ زیندانی دەکرێت، ئەوەش ئـەوەندەی تر ڕقو کینـەی شۆڕشگێڕی ئـەم شـاعیرە بەرامبـەر بەدیکتاتۆریـەت بـەهێز دەکـات. دوای ئـازاد بوونـی لـەزیندان لەسـاڵی 1964 لەئێزگـەی کـوردی بـەغدا دەسـت دەکـات بـەکارکردن. بـۆ ماوەیـەکی زۆر لـەو ئێزگەیـە کاردەکات، لەساڵی 1969 دا سەرباری کارکردنی لەئێزگـە کەئـەو کاتـە فەرمانبـەریش بـوو لـەوەزارەتی ڕۆشـنبیری عـێراق لەبـەغدا لەگـەڵ دکتـۆر ئـەکرەم فـازیل دا ئیمتیـازی دەرکردنـی گۆڤاری بـەیان وەردەگرنو جـەلالی مـیرزا کـەریم خۆی دەبێتە سکرتێری نووسینی ئەم گۆڤارەو تاچەند ژمارەیەك ئەوکارە لەئەستۆ دەگرێـتو، هاوکات لەگەڵ دەرکردنی ڕۆژنامەی هاوکاریشدا دەبێتە لێپرسراوی لاپەڕەی ئەدەبو کاتی خۆی بەرێکی لەنێوان کارەکانیدا دابەش دەکات.

جەلالی میرزا کەریم یەکێك بوو لەدەستەی ڕوانگە کـە لـەکۆتایی مـانگی نیسـانی 1970دا یەکـەم بـەیانی ڕوانگـەیان دەرکـردووە کـەتیایدا داوای شڵەقاندنی گۆمی بەستووی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردیان دەکرد.

ئەم دەستەیەش کەبریتی بوون لەشێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، کاکە مەم بۆتـانی، جـەمال شـارباژێڕیو جـەلالی مـیرزا کـەریم، دواتـر سـێ ژمـارەی بڵاوکراوەی ڕوانگەیان لەشێوەی کتێبدا دەرکردو بەشی هەرە زۆری شاعیرانو نووسـەرانی لاوو نـوێ خـوازی ئـەو سـەردەمەی کـورد بەبەرهەمـەکانیان بەشدارییان لەو بڵاوکراوەیەدا کردووە کەشوێنێکی دیاری لەئەزموونی شیعرو چـیرۆکی نـوێی کوردیـدا گرتـووەو بەشـێك لەئـەندامانی ئـەو دەسـتەیە مێژوویـەکی پرشـنگداریان لـەپانتایی شـیعرو چیرۆکی کوردیـدا بـۆ خۆیـان دروست کردووە.

جەلالی میرزا کەریم لەبەهاری 1974دا کەشەڕی نێوان کوردو ڕژێم دەستی پێکردەوە لەگەڵ بەشی هەرە زۆری نووسەرانو شاعیرانی کورد چووە ڕیزی شۆڕشەوەو لەوێش لەبواری ڕاگەیاندندا دەوری خۆی بینیووە دەوری هەبووە

لەبەرزکردنـەوەی ورەی پیشـمەرگەو جـەماوەردا کـەبێگومان زۆربـەی شـاعیرە دیارەکانی ئەو سەردەمەی ئێمە لەهەمان بواردا دەوریان بینیووە.

لەمیهرەجانی شیعری کوردی‌دا لەشـاری کـەرکوك کەسـاڵی 1972 سـازکرا جەلال یەکێك بوو لەو شاعیرانەی کەبەرهـەمی خۆی بۆ بەشداریکردن ناردبوو بەڵام ڕێگایـان نـەدا شیعرەکەی بخوێنێتـەوە. جـەلال پێش ئەوەی بچێتـە شاخ لەبەهاری 1974دا واتـە هـەر لەسـاڵی (1973)ەوە لەئێزگـەی شـۆڕش‌و گۆڤـاری پێشمەرگە کاری کردووەو چالاکی خۆی لـەو بوارەدا درێـژە پێداوە هـەتا شـەڕ دەسـتی پێکـردەوە ئەوسـاش بەتـەواوی خـۆی بـۆ ڕاگـەیاندنی شـۆڕش تەرخان کرد.

دوای شکستی 1975 جـەلال چووەتـە ئەمـەریکاو لـەوێ جێگیر بووە، بـەڵام لەساڵی 1982دا ئۆتۆمۆبێل لێی دەدات‌و باری تەندروسـتی تێکـدەدات‌و هـەتا کۆچی دوایـی کـرد بەگۆچان‌و زۆر بەناڕەحـەت دەیتوانی بجوڵێـت، ئەگـەرچی باری شکستی جەستەیی کاری لەڕۆحی خاوێن‌و کەسێتی بەهێزی نەکردبوو، هەمیشە گەشبین بوو، بەهیوایەکی گەشەوە ژیانی دەگوزەراند.

جەلال دوای بەسەربردنی زیاتر لەپانزە ساڵ لەئاوارەیی، لـەپاش ڕاپـەڕینی گەلی کوردستان‌و رزگار کردنی بەشی زۆری وڵات، گەڕایەوە ئامێزی نیشتمان‌و بـەئومێدێکی زۆرەوە مایـەوەو بـەو جەسـتە شکسـتەیەوە کەوتـە کـارکردن، لەلایـەك لەڕۆژنامـەی ڕێگای کوردستان‌و بیری نوێ کـاری دەکـرد‌و لەلایـەکی تریش بوو بەیەکەم بەڕێوەبەری ئێزگەی حکومـەتی هـەرێمی کوردستان کەئـەو ئێزگەیە لەمانگی ئەیلولی 1992دا دامەزرا.

جەلال لەژیانی خۆیدا پیاوێکی هێمن‌و لەسـەرخۆو گـەش بین بـوو، لەگـەڵ هاوڕێ‌و دۆست‌و کەس‌و کارو خۆشەویستانیدا نـەرم‌و نیان‌و لێبووردو بوو، بەرامبـەر بـەزوڵم‌و زۆرو مل و ڕان‌و دوژمنـانی ئـازادی‌و دیموکراسـی توونـدو جەسوور بوو، لـەژیانی کۆمەڵایـەتیدا تائاستێکی دیاریکراو کراوە بوو، بـەڵام خێزانی پێك نـەهێنا بـوو.. هـەر بەتـەنهایی مابووەوە. بەداخێکی زۆرەوە، ئـەم مرۆڤە ناسکە هیوا گەشە کۆڵنـەدەرە لـەکاتژمێر یازدەی 14/ 1/ 1993 بـەهۆی نەخۆشـی دڵـەوە لەنەخۆشـخانەی هـەولێر گیـانی پـاکی سـپاردو ماڵئـاوایی یەکجاری لێکردین، پاشان تەرمەکەی هێنرایەوە سلێمانی‌و بەخاك سپێردرا.

جەلالی میرزا کـەریم لـەناوەوەو دەرەوەی وڵات بەرهەمـەکانی خۆی لەگـەلێك ڕۆژنامـەو گۆڤاردا بڵاوکردۆتـەوە. بـەڵام هـەتا دوای ڕاپـەڕین لەشێوەی کتێبـدا چاپ نەکراون. ئەگەرچی یەکەم کۆمەڵە شیعری لەساڵی 1974 ئامادەی چاپکرا بـەڵام کـەخۆی چـووە دەرەوە ئـەو کۆمەڵەیـە کەبـەناوی "کـاروانی وشـەی ڕاچەنیو" بوو چاپ نەکرا.

–لەدەرەوە لـەگۆڤاری ئـاڵای ئەمـەریکاو "الاحـداث"و لەفەڕەنسـا شـیعری بڵاوکردۆتەوە

–ئەندامی یـەکێتی دیموکراتخوازانـی عـێراق بـووە لەئـەوروپا‌و کۆمەڵـەی نیشتمانی لەئەمەریکاو کەنەدا.

–لەساڵی 1982دا کۆمەڵـە شـیعرێکی بـەزمانی عـەرەبی بـەناوی "الـولادە" بڵاوکردۆتـەوە. هـەر لەهـەمان ساڵدا شـانۆییەکی شـیعری بـەناوی "سـەنگەر" بڵاوکردۆتەوە.

–لەسـاڵی 1991دا مەڵبـەندی کـەلتوری کـوردی لەئەمـەریکا نامیلکـەی "چرپەی ژانێکی نقووم بوو"ی بۆ چاپ کردووە

–لەساڵی 1992دا دوای گەڕانـەوەی بۆ کوردستان کۆمەڵـە شـیعری "ڕێگـا دوورەکانی چاومان"ی بەچاپ گەیاندووە کەبەشی زۆری ئەو شیعرانەی لەخۆ گرتووە کەلە 1975 بەدواوە نووسیوونی.

–وەکو پیشتر ئاماژەمان بۆکرد جەلالی میرزا کەریم لـەناوەوەی وڵات‌و پێش ڕۆیشتنی لەگۆڤاری بەیان، ڕوانگە، هاوکاری کاری کردووەو جگـە لەمانـەش لـەبڵاوکراوەکانی تـری ئـەو کاتـەدا بەرهـەمی خـۆی لەشـیعرو وەرگـێڕان بڵاوکردۆتەوە.

کـەتێکڕا دەربـڕی هەوڵێسـتی شـاعیرێکی یـاخین، ئـەوەتا لەشـیعری "سەرەتای داستانێکی ون بوو"دا دەڵێت

ڕێبواری ڕێگەی بێ ناونیشانین
بێ گۆڕستانین
بێ کوردستانین،
یان لە "سووتان لەئاهەنگی ئاشتیا" دەڵێت
خنکاین
خنکاین
لەدووکەڵی بۆخوردی درۆی ئاشتی‌یا

لە "یادو یاقوت‌و نەهەنگ"دا دەڵێت
ئەی کوردستانی پێشمەرگە
ڕاستە دڵی چیاکانت
چاوی گەشی مناڵانت
ئەم ساڵ پڕ شایی‌و ئاهەنگە

لەتاراوگەش جەلال دەڵێت:
ئەمجارەش توولە ڕێی کێوی هیوا ئەگرم
ئەڕۆم بەڵام ئەمجارەیان
ئاڵای گەنم ئەهێنمەوە
:
ڕەنگە بمرم
بەڵام
جارێکی تر.. ئەمکاتەوە بەو سەربازە.. بەو شاعیرە
بەو ڕووبارە ئاوارەو بێ سەرو شوێنەی باوەشت پیا بکاتەوە

جەلالی میرزا کەریم لەتاراوگە سەرباری خەمی قورسی ئاوارەیی‌و تینوێتـی بـۆ نیشـتمان، تاراوگـە قەسـابخانەیەك نـەبوو بـۆ سـەربڕینی خۆزگـەو حـەزو ئاواتەکانی، بەڵکو قەسابخانەی جەستەیشی بوو، لەتەمەنێکی زوودا جەستەی لەکارخسـت‌و ئیـتر جـەلال سـەرتاپا گـۆڕا بـۆ ڕۆح‌و، ڕۆحیـش سـۆزو خۆشەویستی دەبەخشیەوە..

پێدەچێـت سـەلاح شـوان بـەدڵ پەرۆشـی جـەلالی مـیرزا کـەریم بووبێـت‌و ڕۆیشتنەکەی زۆر کاری تێکردبێت بۆیە دەڵێت

ئەم ڕێگایە یەك لاییە
گەر بڕۆی ناگەڕێیتەوە
:
ئەڕۆی لەگەڵ تەما ئەڕۆی
لەگەڵ بارانا دێیتەوە

گوڵبژێرێك له شیعرەكانی

# تەمەنی دەساڵەی دێڕێك

چەپڵە ڕێزان..
نمەی چاوی ئاسمانێكی پڕ لە گریان
بەسەر یادی ڕاچەنینی شارەكەما
ئەبارێنن..
دروشمە بەخوێن تەڵخەكان..
سەرە نێزە مەدالیای بەهرەی تاوان
بە بەرۆكی قارەمانی مێژووەكەما
ئەچەقێنن
سرودی سەروەختی زاری ڕیاكاران
وەكو سنگی زبری هەوری ڕەشی زستان
نیگای چاوی ئەستێرە لەوەرزی خەما
ئەپروێنن
ڕۆژنامەكان
كامێرا چاوچنۆكەكان
میكرۆفۆنی وتار بێژە درۆزنەكان
هەموو ڕۆژێ لە فەرهەنگی
ناوو دەنگی
دلێرانەی شۆڕشەكەما
باڵی وشە
زاری وتە
ئەقرتێنن

*  *  *

وا.. دەساڵە چاوی هیوا
گڕ ئەڕێژێ
وا.. دەساڵە چەكی بڕوا
تۆوی خۆزگە
لەناو زامی
سەنگەرەكانا ئەنێژێ
وا. دەساڵە.. گۆڕستانی سنگی كچان
داستانی شەهید ئەنێژێ
هەتا ساوای سەر بێشكەشمان
ژەكی خەم و ژان ئەچێژێ.

*  *  *

خەونی شاری حوزەیرانمان
كەی كەژاوەی گڕو خوێنی بەڕێ ئەكرێ
جارێكیتر.. شەهیدانمان
كەی پێ ئەگرێ
كفن ئەدڕێ
ڕائەپەڕێ؟!

*  *  *

مناڵێكی لەدایك بووی قریشكەی قوڕگی خنكێنراو
لە پێشمەرگەیەكی پرسی..
كەی هەنسكی،
دە ساڵەی دایكم بەر ئەگرێ؟!

*  *  *

تفەنگ گریا:
"وا.. دەساڵە.. خەرمانی خوێنمان شەن ئەكەن"
هەزاران چاوی ڕەنگ گریا
"وا.. دە ساڵە.. كان وشەمان بۆگەن ئەكەن.

*  *  *



پێشمەرگەیەک لە شاعیرێکی نوێی پرسی
کەی شیعرێکم بۆ ئەنوسی
پشکۆی ئاگردانی زامم هەڵگیرسێنێ
لەشکری خەم بوروژێنێ؟!
*　*　*
هاژەی یادی دە ساڵەی شاعیر.. چرپانی!!
جارێ ئەمساڵ.. هۆنراوەکانم ئەدڕێنم
چونکە زاری وشەکانی
بێ گوللەیە..
بێ گوللەیە..
چونکە سنگی دێڕەکانی
بێ نەڕەیە..
بێ نرکەیە..
*　*　*
چاومان..
چاومان، هەموو ڕۆژێ بەدوای ڕێگای ژانی
کوردستانی
لەت کراوا.. هەنگاو ئەنێ
ناومان
هەموو ڕۆژێ لە سای شین و قوڕپێوانی
هەتیوانی
بێ ناونیشان.. خۆی ئەڕنێ.
*　*　*
"سێبەری تەرمی مردووان بەخوێن بشۆن"
سەر هەڵگرن.. بڕۆ.. بڕۆن"
*　*　*
دڵدارەکەم.. دوای خوێندنەوەی.. ئامۆژگاری
ڕێکخەری شار..
ووتی: بۆ کوێ.. سەر هەڵگرم..
قوڕگی کام نەهەنگی تاری
دەریای شەوگار
بەسەولی پرچم هەڵبدڕم
*　*　*
مەلا بانگدان.. هێشتا دوکەڵ..
لە ئاسۆدا گرێی ئەدا داوی مەتەڵ
تارمایی شۆڕە سوارێکی باڵا ئاگر..
لەناو دۆزەخی هەزاران پرسیاری کوێرا خۆڕاگر
شریخەی قامچی وەشانی
وەک گۆرانی
ئەیوت.. سەرهەڵگرن.. بڕۆن..
جارێکی تر سەنگەر بە خوێن.. بەگڕ.. بشۆن.

سەرچاوە:
هاوکاری ژمارە (40) کانوونی دووەمی 1971.



## وەرزەکان

چوار وەرزی ساڵ
لە دامێنی ئاسمانی ووڵاتی منا
لە چوارچێوەی بێ کۆتایی
تەمەنی ئاواتی منا،
بۆتە ئاوێنەی ئاوەژووی
مێژوویەکی ئێجگار جەنجاڵ.

(1)بەهار
بەهارمان دی و لە جیاتی نێرگزی دیاری
چۆڕاوگەی خوێن،
بەری دەرگای نەورۆز ئەگرێ..
لە یادی ناشتنی تەرمی دوێنێی پڕ لە نادیاری
لیستەیەکی تری قوربانی
لەبەردەم دەرکی سەرادا هەڵئەواسرێ.

(2)هاوین
هاوین دادێ و
خۆری چلە ئارەقەی گڕی لێ ئەتکێ..
لێوی کانیاوەکان چین چین
بەدیواری خۆی هەڵ ئەستێ.
لە جیاتی سروەی پڕ بزەی
سەرچاوەی زەڵم و بادینان و شەقڵاوە..
گاز و بۆمباو فڕۆکەیە،
ڕەشماڵی مەرگی هەڵداوە.

(3)پایز
واسەردەمی بەرەوچوونی سروشتی گەڵاڕێزانە
پەڵە چەواشەی ساڵێکی کەس نەزانە..
-با هەڵوەرێ
خونچەی چاوی کووچەکانی ئومێدی شار،
تازە!.. خۆزگەی عیشقی ئیمڕۆ
ناچێتەوە بەرهەوارگەی پاروپێرار.

(4)زستان
دیسان نۆرەی گەردەلولی چەک لەشانی
خۆشەویستی هەڵچونی بەرەو ئەشکەوتە..
زستانە!.. شەوچەرەی هیوای
پێشمەرگەی ئەم کوردستانە لەت و پەرتە،
بێدارییەوە.. تێرامانە لەیەکتری و نەنووستنە
بۆ وەرزی نوێ: ڕێگای بیرو چەک گرتنە.

بەهاری– 1989

# ڕوانینەکانی چاوی شەقام..

هۆن.. هۆن نیگای ئاگری باڵی کاروانمان
بەسەر باخی مەرگی بەهاری ئاسۆدا ئەبارێنێ..
هۆنراوەی زام..
تەڵ.. تەڵ چڵی خوێنی وشەی سەر بڕاومان
لەڕێژنەو تاوی هەناسەی ژاڵەو بیدا دائەچێنێ
لێوی پەیام..
گەڵا.. گەڵا تریفەی بزەی هاوارمان
بەناو ناخی ڕێگای قوڕپێوان‌و شیندا ئەوەرێنێ.
خۆری ئەنجام..
تاڵ.. تاڵ ورشەی شنەی ئاڵای هەنگاونانمان
بەناو سنگی تەم‌ومژی قەڵای شەودا ئەپرژێنێ.
شەقام: من کیشوەری زامم
زام: من شۆڕشی پەیامم
پەیام: من چەکی ئەنجامم
ئەنجام: من گۆرانی ناو سەنگەری شۆڕشگێڕانی
جیهانم..
من ڤێتنامم..
من پۆلیڤیام..
من سۆدانم..
من شۆڕشی کوردستانم
"وێڵێکی ڕێ.. ڕێبواری ڕێی بێ کۆتایی
پەیتا.. پەیتا
خەنجەری لەسێبەری باڵای تەمەنی ستەمکاری
هەڵئەکێشا...
دیواری خوێن خۆی لەفرمێسك هەڵئەکێشا.
سەنگەری خەم چیای قورسی ڕێی نۆ ساڵەی
تەنیا خواستێکی ئەکێشا."
–گۆرانی.. لەناو گەرووما ئەخنگێنرێ
گۆرانی.. لەناو سەنگەرا ئەسوتێنرێ
کەچی هێشتا.. هێشتا سەنگەر
نازانم بۆ.. بۆ لەئاگری ناو گەرووی خۆی ناپرسێ؟
"ڕێی گەرداوی خوێنی هیوا
بەرەو ئاسمانی ئەودیوی مەبەست ئەڕوا..
ئەفڕێ.. ئەکشێ، تا چاو بڕکا.. ئەڕوا.. ئەڕوا



ئا ئەو لەشەی.. بەباڵی‌یەوە هەڵئەواسرا
ئا ئەو زامەی.. بە ناوچەوانی‌یەوە ئەنرا
گەرووی تفەنگی پێشمەرگەی ئەهێنایە سروودی گڕ
چاوی تۆڵەی ناو سەنگەری
ئەهێنایە پەڵەی بارانی خوێنی خوڕ."
–کوا ڕەشەبای گڕپژێنی
ناو گەرداوی دڵی تۆڵە
کوانێ شنەی تەم ڕەوێنێ
باخی لێوی بیابانی سنگی ئەم وڵاتە چۆڵە؟
"خۆر.. بۆ پەڵە هەورێ ئەگری
هەور.. بۆ باخ
باخ.. بۆ دار بەڕوویەکی شاخ
داربەڕووش.. بۆ تەورێ ئەگری."
–ڕێبوارێکم.. بۆ ڕێ ئەگریم
فرمێسکێکم.. بۆ زێ ئەگریم.
"ئاگر.. لەدوای ماندووبوونی سووتاندنی خەرمانی
وشك، هەناسەی خەمی هەڵکێشا..
تۆڵە.. بەناو گەرووی ڕقا وەك تولە ڕێیەکی
خوێنین، بەرەو دڵی وێرانەی سەنگەری وشەی
خۆر داکشا."

–ئەنەرِێنم:–
من رِێبواری هیوایەکی سەرهەڵگرتووم.
ئەچرِێنم:–
من ماچێکی بۆ لێو تینووم.
"رِێگا دوورە..
داستانی خەم کێوی گرِی سەرەو ژوورە
رِێ بۆ مەڵبەند.. چلەی دۆزەخێکی سورە
شەپۆلی لێوی گۆرانی پرشنگی خۆری خنکاوی
دەریای خوێنی بێ سنوورە..".
–ئەرِۆم..
لەناو شاری خەما زەنگی بزە
بۆ چرۆی گۆرانیەك رِائەوەشێنم.
ئەرِۆم..
لەناو گۆمی خوێنا چرای وشە
بۆ پشکۆی هۆنراوەیەك دائەگیرسێنم
ئەرِۆم.. ئەرِۆم
من بۆ رِێگەی ئاگر سووتووم
ئەرِۆم.. ئەرِۆم
من مەرگی پێشمەرگەی زیندووم
من گۆرانیی ئاسۆی چاوم
من ئازاری ئالآی ناوم
من.. هۆنراوەم،
بەبێ سەنگەر هەرگیز ناژی
من.. سەنگەرم،
بەبێ دەفتەر هەرگیز ناژی
من.. لەمەرگا
ناوی ژیان لەخۆم ئەنێم
من.. لەدەنگا
شیعر بۆ چرپەی چاو ئەڵێم
من.. لەتۆفی خوێن هەڵسانی رِێگای شارا
هەنگاو ئەنێم
من چارۆگەی کەشتی باخی
هەڵچوونی زێم.
"شۆرِەسوارێ..
بۆ پرسیارێ..
تاوی ئەدا.. باڵی رِۆژگار
رِاوی ئەنا.. خەونی شەوگار
هەر یەك وەڵام.. ئەبوە هاوار
ئەبوە سۆزی گەرووی قەتار"
–من گەردنی ئاسۆی شاری پرِ هەنسکی
خۆم ماچ ئەکەم
"بزەی نەرمی شەپۆلی دوو لێوی وەڵام
لەبەردەم دەرگای گریانا
ئەبوە ئەنجام
ئەبوە پەیام"
–من رِەشماڵی خێڵی شۆرِش
لەناو شاری کۆچەرانا
لەناو وەرزی بیابانا
لەناو دڵتانا هەڵئەدەم.
"چاوی ژیان
دەرگای داستان
لەپرسیاری باڵآی لەخوێن هەڵکێشراوی
شۆرِەسوارێك کرایەوە."
–ناوت نابەم
خۆت حەشاردە.. دوژمنداریت
باست ناکەم
بریندارِیت..
"ژانی زامی.. بێ دەنگ نەبووی هێشتا بەسوێ
چاوی ماڵی..
نیگای کاڵی..
پرِ کرد لەخوێ"
–من نەهاتووم.. ماچ کەن زامم
پەنای دەن نەرِەی پەیامم
من واهاتووم
گەرووی وشکی چەکەکانتان
لەکارێزەی زامی قووڵما لەخوێن تێر کەن
من واهاتووم مناڵانتان
بەئەلف و بێی شۆرِش فێر کەن

**سەرچاوە:**
**گۆڤاری بەیان ژمارە چوار ساڵی** 1970





# ڕازەکانی هەفتە

**دڵداری:**
من لە وانەی دڵداریدا..
لە دوا ڕیزی قوتابییەکانی پۆلا بووم
چونکە تەنیا لەگەڵ ژانی..
ئاوارەیی خۆشەویستەکەی خۆما بووم.

**نهێنی:**
ئەزانن من پاسەپۆرتی
ڕەش کراوەی فرمێسکم لە گیرفانایە؟
یەك یەك ئێستگەکان جێ دێڵم،
بەبێ ئەوەی بزانن چی لە دڵمایە.

**شەرم:**
بەرێکەوت کە لە ڕێگادا تۆ ئەبینم،
شیعرەکانم شەرمەزارن..
کە نات بینم،
چاوەکانی بینینەوەی وشەکانم هەر بێدارن.

**نیشتمان:**
کە هەست لەناو ئاگری دوور وولاتیا،
ڕازەکانم ئەسووتێنێ..
بەهاری ڕێ، گوڵی دەنگم
لە پایزی بەستەکانا ئەپروێنێ.

**پەشیمانی:**
دڵدارەکەم چەقۆی ڕقی زیزبوونی خۆی،
بست بست بەناو گیانما گەڕان..
هەتا لەناو پەڕەی دڵما،
لە خوێنی خۆی دەریای پەشیمانی هەڵسان.

**دڵ:**
من ئێستاکە لەدڵ دوورم، نازانم هەم..
یاخود ڕێچکەی نەمان ئەگرم.
ۆپ.. پەیتا پەیتا
بەناو ی
ەکا بتوێنەوە.
بتوێنەوەو ببنە تاجی
پ
ە
ل

**شۆڕش:**
ئەتانەوێ من بناسن؟
من عاشقی ڕێگایەکم مەرگی تیابێ،
کە هەڵوێست مرد.. بۆچی نابێ؟؟
دەروون شیعری شۆڕشێکی تری تیابێ.

1977

# سووتان لە ئاهەنگی ئاشتی‌یا..

خنکاین.. خنکاین،

لە دووکەڵی بوخوردی درۆی ئاشتیی‌یا

برژاین.. برژاین،

لە دۆزەخی بەهەشتی پڕ سوێی ئاشتی‌یا

کوژراین.. کوژراین،

لە ژێر گەڵا زەیتوونی بێ بۆی ئاشتی‌یا

ڕزاین.. ڕزاین،

لەناو کۆشکی وەک زیندانی نوێی ئاشتی‌یا

***

پەنجەرەکان.. بکەنەوە

با هەڵمژین..

هەناسەی شەهیدەکانمان..

دەروازەکان.. بکەنەوە،

با ببیسین..

گۆرانی پێشمەرگەکانمان..

چاوی تفەنگ..

زیانی دەنگ،

هەڵبێننەوە..

شاری گریاو..

ژیر کەنەوە..

باڵ بە کۆتری سەربڕاو،

بگرنەوە..

لە سەنگەرا..

لە سروودی تەواو نەبوونی جەنگاوەرا..

داستانی تەمەنی ئاشتی،

ئاشتی ڕاستی..

بنووسنەوە



## سەرەتای داستانێکی وون بوو!

دەمێکە پرچی زەردی تیشکی خۆر،
بۆ بووکی ناسۆر...
ئەهۆنینەوە..
لەخەرمانەی مانگ،
لەچرپەو.. لەبانگ،
لەلێلی‌ی گۆمی چاوی بێ برژانگ..
وردە زەرکەفتی وشەی جۆراو جۆر،
لەسوور!.. هەتامۆر!..
خڕ ئەکەینەوە..
لەچاوی ماتی..
گەڵارێزانی پایزی زەردا،
گوڵی ئاواتی،
ئەزۆك ئەنێژین..
لەناو دێراوی زووخاو و دەردا،
تۆوی پووچەڵی خۆزگە ئەرێژین..
کلافەی کلووی..
بۆ سووتان تینووی،
بەفری ئازاری بیر تەزینی سڕ
بەمەکۆی خەیاڵ..
خەیاڵێکی تاڵ،
ئەکەینە شاراو دەستەنەی ئاگر..
دەمێکە ڕۆنی..
سەرتوێژی وێنەی بێ‌ڕەنگ‌و بۆنی،
ناو داستانی کۆن ئەلێسینەوە..
خەم لەدەلاقەی زامی بەسوێدا
لەچاڵی چاوی، پڕ خۆڵ‌و خوێدا
ئەتوێنینەوە..

دەنگ لەگەرداوی شەوی دووکەڵا
لەناو ئاوازی بێ‌پەل‌و چڵا
ئەپێچینەوە..
لەکۆی زووخاڵی دۆزەخی سووری‌ی
هاوینی ڕەشا.
گەردانەی تۆفی خەمی ناسۆری‌ی
ئەکەین بەسنگی هەتاوی گەشا..
دەمێکە نەڕەی کەللەسەری گۆڕ،
لەناو چیرۆکی
بێ ناوەڕۆکی
بەبێ بارانی
مێژووی خەزانی
ژێر تیشکی کزی مەشخەڵی چاو شۆڕ،
ئەخوێنینەوە..
هەزار جەنگاوەر..
گەشترین باوەڕ..
بۆ یەك بەڵێنی درۆی خوێنە خۆر،
ئەگۆڕینەوە..بەدەیان.. پەیکەر..
شەهیدو.. ڕابەر..
بەفرمێسکی پڕ چڵپاوی ناتۆر،
ئەشۆرینەوە..
دەمێکە هەین‌و! بەڵام،
هەرنەبووین،
دەمێکە زیندووین، بەڵام، هەر مردووین.
دەمێکە بێ خواین،
بێ بیرو بڕواین..
ڕێبواری ڕێگەی بێ ناونیشانین
بێ گۆڕستانین..
بێ کوردستانین..
کوا؟.. کەی ئەبینە خاوەن گۆڕستان...
خاوەنی کوردستان؟

## خۆشەویستی‌یەکی شێتانە

گیانە!.. نەم ویست
بەم چەند دێڕە..
لاڵ و کوێرە،
بڵێم: تۆم ویست
چونکە هەرچی.. وزەو توانای
شیعرە هەمە..
هەڵی ڕێژم.. بۆتی بڵێم

هێشتا کەمە.
ڕەنگە نەغمەی شیعروتن
تەواو ببێ
سازو دەنگی پیاهەڵوتن
تەواو ببێ..
گوڵ هەڵوەرێ
هوزار بمرێ
بەڵام.. هەتا رووی تەبیعەت
وا والابێ
هەرگیز.. هەرگیز.. جوانی‌ی ئافرەت
تەواو نابێ

* * *

وەك شاعیرێك.. شیعرەكانم
هەر بە موڵكی خۆم نازانم
بەڵام، وەك دڵدارێك كە هەم
وا تێ ئەگەم:
هەر جوانیی ئافرەت پەرستم
هەر بۆ ئەویش: خۆشەویستم!
*      *      *

من ئەمەوێ.. هەر وەكوو شێت
رێ بگرم لێت..
هەر چیم بوێ
داوای كەم لێت.

من ئەمەوێ.. گوڵی ئاگر
لە جیاتی زێڕی ساردو سڕ
بكەم بە قژی ژاكاوتا
بە بەرۆكی وەك هەتاوتا
*      *      *

وەك ڕێبوارێ..
بست بست دونیای جوانت پەی كەم
وەك باڵدارێ..
ئاسمانی پەنهانیت تەی كەم
وەكوو شێتێ خۆشەویست بم
وەكوو شێتێ تۆ پەرویست بم

## یادو.. یاقووتو.. نەهەنگ

(1)

تا دوێنێ بوو..
نەورۆزەكەی شاری هیوا
بەهارێكی پڕ لەسوێ بوو..
گوڵی ووشەی تیا ئەپروا
***

دەروونی یاد.. بێ كڵپە بوو
سنگی ووتە.. بێ چرپە بوو
ئاسمانی بیر.. ڕەشی تێر بوو
چاوی تۆڵە.. هێشتا كوێر بوو
***

تادوێنێ بوو..
شاری نووستوو..
هەر خامۆش بوو،
گۆڕستانی بیرەوە چوو
فەرامۆش بوو
***

ئەشكەوتی چۆڵ...
درەختێكی بێ چرۆ بوو..
ئاگردانی پڕ خوێن و خۆڵ،
بێ پشكۆ بوو..
***

تادوێنێ بوو..
چەكی خەبات،
هێشتا متی ناو سەنگەر بوو



هیواو ئاوات،
هەتاوێكی بێ سێبەر بوو
***

كاروان وێڵ بوو..
چاوەڕوانی
پێشەنگێكی قارەمانی
مەردو قەڵای دوژمن كێڵ بوو

(2)

لەئاسۆی بێ پێکەنینا
لەگەڵ زەردەی ئاوارەیی..
ژەنگی تاڵی خورنشینا
لەئاسمانی ماتەمینا
لەدووا چرپەی ورشەی وێڵی
ئەستێرەی شەوگاری ژینا
لێوی خۆری خنکاوی خوێ
کەوتە بزەی ئاورنگ ڕشتن
کاروانەکەی جێماوی ڕێ
کەوتەوە بەستەو ڕۆیشتن

***

لە پڕ ووشەی گەردەلوولا
لەگێژاوی..
ڕەنگ زەردو هەڵبزرکاوی
ڕۆژانی ڕەشی ئەیلوولا
دەنگی ڕاچەنین و هەڵمەت
چەکی بڕوای دا بەمیللەت

***

باخی زەردی ئەیلوولی رووت
بەپەڵەی ئاگرو باروت
گوڵاڵەی هیوای شۆڕشی
نەتەوەی کوردی تیا پشکووت

(3)

ئەیلوول هات و ساڵ بەسەرچوو
گڕی کینەو ڕق بێ پشوو
دارستانی..
بێ جریوەی کوردستانی
ئەکرد بە زووخاڵ و ڕەژوو..
بەڵام ئەو بڕوایەی وەکوو
شاڵاوی ئاگرو پووشوو،
لە سەنگەرا..
لە ئەشکەوتا..
لە هەڵمەتا..
لە پژانی مێشك و سەرا
لە شەونخوونی ڕابەرا
بەرووی دوژمنا هەڵئەچوو
بە جۆش تربوو.. لە ناو نەچوو
.. لەناو نەچوو

(4)

ئەی کوردستانی پێشمەرگە..
ڕاستە دڵی چیاکانت،
چاوی گەشی مناڵانت..
ئەمساڵ پڕ شایی و ئاهەنگە
بەڵام.. قسە، هێشتا.. ڕەنگە
خواست و مەرام..
یاقووتێکی شەوچراخی..
ناو گەروی تاری نەهەنگە..

ئەیلوولی 1970.

---

# پەیامە ژێ

"بۆ گیانی پاکی –شێرکۆ–ی برازام و هەموو شەهیدانی گەل و نیشتمان"

ئەوسا تەمەنی ئەم شیعرە
حەوت ساڵان بوو..
هەرەس هات و
"چۆمان"ی دڵمان جێهێڵاو
ڕێی نادیدەی
گۆڕێکی ترمان گرتەبەر.

* * *

خۆم لەوێ بووم
بەری چاوم، بەهارێکی خۆڵەمێش بوو..
ئەمدی ڕێچکەی.. هەنگاونانیان
چۆن لەشکری گوڵاڵە سوورەیان شێلاو
سلاوی چەك ڕاوەشانیان
چۆن سەریان بە شاخ دانەوان..
خۆم لەوێ بووم
تۆش هاوڕێ حەوت ساڵانەکەم!
مەگەر لەگەڵ منا نەبووی،
ئەمانبینی.. سنووری وێڵ
وەك ڕەشەبا هەڵیکردو
لوتکەی عیشقی
ئێمەیان هێنایە خوارێ و
بۆ دەربازی خۆیان کەچ کرد.

* * *

ئای شیعرە حەوت ساڵەی ئەوسام
بیرمە چرپەت
بەگوێی هەورا ئەئاخنی و
بارانێکی پڕ سەوزاییت
بەناو کێڵگەی چاوا ڕژان..
بیرمە خورپەت
شەپۆلە ماچێکی خەونی پرشنگداری
پڕ ئەستێرەی
لە ئاسمانی سینەی تارا
چەپکە مۆمی ڕێگەی تازەی دائەگیرسان..
*   *   *
پەڵە هەوری سەر ئەزمری
توانەوەی
گەڕانەوەی
ناو باوەشی سلەیمانی
ئەم فرمێسکە
بێ ووچانەی بە من هەڵڕشت.
*   *   *
چاوم گێڕا بەسەنگەری
هەڵسانەوەی
ئەو دێڕانەی
کوژران و بوونە قوربانی
نەء.. بوونە ڕەنگ و بروسکە
تابلۆی بارانە گڕێکی نوێیان دارشت.
*   *   *
چاوم گێڕاو.. ئەمجارەیان
لە شەوگاری
سنووری ڕێی خەونەکانی ووشیارییا
لە ڕۆژگاری
شەقامە ڕێی ڕێبوارییا
هەر تەنافی سووری خوێن بوو
بەڕیز زامی شەهیدانی
پیا هەڵخرابوو بست بە بست.
*   *   *
ئەمجارەیان..
هەژدە گوڵی
ساڵنامەی تەمەنی ئەم مەنفایەم وەران،
هەژدە دڵی
ئاگردانی دوور کوردستانم هەڵقرچان،
هەتا ئەم ووشانەم پێ ڕست.
*   *   *
شێرکۆی حەوت ساڵەی مامە گیان،
مامەی شیعر و چاو لێکنەنان!.
بیرم ناچی



تیشکە چاوی هیواکانت
سەرگەردان بوون..
بیرم ناچی
باڵەفرێی زەردەخەنەی لێوەکانت
بێ ئاسمان بوون..
چۆن بیرم چێ
کە هاژەی سیخۆی مەرگ ئەهات،

ئیتر هەناسەی ژوور نقەی لە خۆی ئەبڕی
گۆرانیی ناو وێنەی بە دیوارا کراو
لەرەی پەردەی
ڕووی پەنجەرەی خۆر ڕاکشاو
باڵای کلاشنکۆفێکی هەڵپەسێنراو
دوو سێ هاواری هەڵگیرساو
یەک لەداوی یەک
لە زیندانی ترسا ئەخزان.
چۆن بیرم چێ
هەموو جارێ کلاشەکەت
کلاشە پێی حەوت ساڵەکەت
دائەکەنی و بەرەو ئاسمان
ڕات ئەوەشان
گوایە مێکی بیست و یەکت پێ ئەترسان.
بیرم ناچێ..
چۆن ئەو ڕۆژەم لەبیر بچێ
لە مەریوان
دوو باڵای یەک دڵ و یەک گیان
بەرامبەری یەکتر وەستان
"باڵای یەکەم"
–گەڕانەوە..
بۆ دۆزەخی مێژوو سووتان
بۆ نیشتمانی قوڕ پێوان
بۆ کاروانی خۆ بەکوشت دان
"باڵای دووەم"
–هەر مانەوە..
لە حەسرەتی گەڕان بەدوای کوردستانا
بەدوای تەمەنی گریانا
نەء.. زریانا
* * *
دوو باڵای لەیەکتر ئاڵاو
دوو ئاوێنەی یەک ڕووی هەتاو
دوو ئەستێرەی بەناخی یەکترا کشاو
دوو نیگای عیشق بە ئەلبوومی خەونا ڕژاو
ئیتر لە یەکتر دابڕان،
لەبەر دیواری شمشێرا
لە گوێ جۆگەیەکی سوێرا
لەگڕی ڕێیەکی کوێرا
سەر بڕان و
سووتێنران و
نەء.. هەڵواسران.
* * *
لەوساکەوە خۆری حەزم
چاو هەڵدێنی و



وێڵە بەدوای خۆرنشینی گریەو شینیا..
مانگی دڵم
گەردانە خەرمانەی ملی ئەپچڕێنی و
نوقمە لەناو گەرداوی سەرگەردانیا..
ماچی لێوم
داستانێکی خەوی تەمەن هەڵئەسێنێ و
ئەینێرێتە بەر ژووانیان..
سۆزی هۆنراوەی پەشێوم
دێڕی سبەی ئەسووتێنێ و
ئەیکاتە سووتووی سەر ڕێیان..
* * *
کاتێ هەوری
وەرزی بەهاری ڕاپەڕین
هاتە وەرین،
دەشت کەوتە چەپکە نێرگزی ووشە چنین.
کە سێبەری
کڵپەی تینووی باوە گوڕگوڕ
هاتە هەڵچوونەوەی بەخوڕ
چەخماخە کەوتە جۆلانەی گڕ ڕاژەنین.
* * *
قەڵەمی ناو پەنجەکانم
سەرگەردانی پەڕەی دڵ بوون..
چرۆی فرمێسکە ڕژانم
ژانە پڕ باخێکی گوڵ بوون..
شەونخوونی خۆ سووتانم
گرشە پەیڤێکی بەکوڵ بوون..
* * *
ئاخ.. هاوڕێ گیان!
گەر بزانی؟
فێری چ سەرەمەشقێ بووم
ئاخ.. کوردستان!
گەر بزانێ؟
تووشی چ جۆرێ عیشقێ بووم
–فێر بووم.. گریەم
لە سەرەمەرگی دایکما
بە کوشت بدەم.
–سلەیمانیی جگەر گۆشەم
لەبەردەمی کەژاوەی بووکی کەرکووکما
سەرەو لێژکەم.
* * *
ئاخ.. پەیامی
خۆشەویستی سەر هەڵگرتوو
لە کوێی هەتا
تارای ئاوریشمینی خوێنت

بەرووباری بەرەو دڵتا
هەڵکێشمەوە..
ئاخ.. دەفتەری پڕ لە زامی
ووشەی تینوو
لە کوێی هەتا
بارانێکی گوڵ پڕژێنت
بەناو بیابانی سنگتا
بڕێژنمەوە..

* * *

لەوکاتەوە
چرۆی بڕواو ڕوخساری ڕێ
باڵە فرێی هەڵبەستە ژێ
لە ئاسمانی شین و؛ شینا
پۆلە مەل بوون
نەء.. تفەنگی ئەودیو کەل بوون
بەناو زامی پڕ سوێمانا
هەڵسانەوە.

* * *

لەوساتەوە
بەژنی پەیکەر
نەرەی مشت و سۆمای خەنجەر
لە داستانی مەم و زینا
مەزارگایەکی پەل پەل بوون
نەخێر.. کێلێکی مەشخەڵ بوون
لە ژوور سەری شەهیدانا
گریانەوە.

* * *

ئەمویست هەستم
پەردەو کوللەی شەپۆڵ بێ و
نێرگز نمەی
بووکی دەریای خەوبینینت
وەك پاساری
تیایا بنوێ.
ئەمویست دەستم
سەرینە نەرم و نۆڵێ بێ و
چڵە وورشەی
لەنجەی چیای پێکەنینت
وەك وەرزێکی نادیاری
لە دوتوێیدا ئارام بگرێ.

* * *

ئای دار ئەرخەوانەکانی
سنگی سەیوان،
لق و پۆپی خۆتان بڕنن
بیکەنە ئاڵای فرمێسك و



چاوی نەورۆزی پێ بسڕن!.
ئای.. ئەستێرە وێڵەکانی
سەر پەڵەی خوێنی سی ملیۆن
گوڵاڵە سوورەی ناوچەوان،
دە بکشێن و..
ڕێی ئاسمانی خۆتان بگرن!.
ئای.. دیوانی
دیرە نیگای بێ سەروشوێن.
دەهەڵسێن و..
بام پەرەی مەرگی بیرچوونتان،
سەرچۆپی شاییمان بگرن!.

* * *

ئای.. گڵکۆکەی سلەیمانی!
با شەوگاری.. خەوبینینمان
با ڕۆژگاری.. نهێنیمان
لێك بڕژێن و،
دڵۆپ دڵۆپ.. پەیتا پەیتا
بەناو یەکا بتوێنەوە.
بتوێنەوەو ببنە تاجی
پەلکەزێڕینەی تەوقە سەر
نەء.. جامانەی سورمە چنی
ترووکە چاوی زەردەپەڕ
بۆ پەیکەری
شەهیدانی
کوردستانی
بێشکەو سەنگەر.

1992



# ڕێگا..

نامە داخراوەکانی دڵ،
لە تەوژمی خۆشەویستی لێوی بەفری
تابلۆی شانۆی خۆرهەڵاتی ڕێگاکانا..
ئەکرێنەوە.
لە کاروانی گەڵاڕێزانی پایزی گوڵا،
لە زستانی سنگی هەورا..
هەمان وەرزی نمەی بەهار،
بەسەر لوتکەو
قەدپاڵ و نشێوەکانا..
ئەڕژێنەوە.
*   *   *

سێبەری باڵدارێکی بێ پاسەپۆرتی
سەرهەڵگرتوو،
بەندەرەکانی زریانی
وەیشومەی شەوی هەڵتەکان.
هەناسەی گەرمی هێلانەی
گەرووی خوارووی،
بووە ملوانکەی ژیلەمۆ و..
لە گەردنی نەرمی وەك لۆکەی خوی ئاڵان.
*   *   *

–ئەی باڵەکانی پرشنگی خۆری وشە!
بەستەڵەکی دەمارەکانی بێ دەنگی،
جێ مەهێڵن.
پەردەکانی پەنجەرەی زامی بێ گرشە،
بە دواتانا.. لاشەی زەوی
وێڵ ئەکێڵن.
*   *   *

کێ ئەیزانێ؟..
جانتایەکی خۆڵ لێنیشتووی ماندووی ڕێگای
مەڵبەندێکی دووری کەساس..
ئەگاتە بەردەمی پاسگای تەمی تەکساس.
ڕەهێڵەی بارانی خۆری،
تۆزی سەر ڕووی ئەشواتەوە..
گوێزانی بروسکەی دڕی،
دوگمەی سنگی ئەکاتەوە.
کێ ئەیزانێ؟؟
*   *   *

کێ ئەیزانێ؟..
نینۆکی درێژی ئەوسای مەلای خەتێ
لە دووتوێی ئایەتەکانی ناو قورئانا
سەروچاوی یەزدان ئەڕنێ...
هەمان و هەمان پەنجەی تر



نە جارێ.. سی و چوار جارێ تر
نەخشەی بەهەشتی هەژاران
لەبەر دەرگای کۆشکی سپی و
سوور و سەوزی (ڕەشا) ئەدڕی.
*   *   *

نەوەك.. هەور،
کە سەرچاوەی خۆی ئەزانی.
نەوەك.. ڕاچڵەکینی تەور،
کە مەچەك و
بازووی کاوەی خۆی ئەزانێ.
نەوەك.. ڕەنگی ئەرخەوانی
گۆڕستانی پێشمەرگەکان،
کە لافاوی
ڕێی خوێنینی خۆی ئەزانی.
نەوەك.. چلەی پرسەی پشکۆی ئاگردانی
دەفتەری ڕێی بێ نەواکان،
کە سروودی
یەکگرتنی خۆی ئەزانی.
بەڵکو ئێوەش..
گەورەکانم،
ئەتانزانی.
*   *   *

ئەتانزانی.. پەری ئاوات،
لە کەژاوەی دڵدارانی ئاوارەوە
نەبێ.. نایەت.
ئەتانزانی.. کەشتی شادی،
لە ڕۆخی زامی دەریاوە
نەبێ... نایەت.
ئەتانزانی.. خۆر لە چرکەی
پەلەپیتکەی تفەنگەوە
نەبێ.. نایەت.
ئەتانزانی.. شنەی ئاڵا لەناو ڕێژنەی
ڕاست بوونەوەی سێدارەوە
نەبێ... نایەت.
*   *   *

پۆستەرێکی ناوچەوانی هەواڵنامەی
بی کۆتایی هاوارێکی ڕووت و برسی..
دەنگ و باسی "کۆماری ئیفلاتوون"ی لە:
گالیسکەی هاوین و قژی
بێ قردێلەی گوڵە گەنمی ئەپرسی.
پەپوولەکانی سەرابی مۆمێکی کوێر،
چین چین بەنێو ڕەنگەکانی
تابلۆی تراژیدی پرسا گوزەریان کرد..
مەشخەڵی بەر پێی ناسۆریان،
ئیتر سەرەتای توولە ڕێی
بەرەو عیشق دەستی پێ کرد.

1979

نمونەیەك لەوەرگێرانەكانی جەلالی میرزا كەریم

# كوردستان

هۆنراوەی شاعیری شۆڕشگێڕی فەلەستینی- مە حمود دەروێش-
گۆڕینی: جەلالی میرزا كەریم



-1-

لەگەڵتانایین..
لەگەڵتانایین..
كاتێ بۆمبا لەكێوا ئەتەقێتەوە
دڵی خەڵكی.. لەگەڵتانە..
چاوی خەڵكی لەتەكتانا بەسەر دركا
گوێ ناداتێ لەگەڵتانا ئەڕوا.. ئەڕوا
كۆیلەكانی هەموو دنیا
لەكەمەری ئۆقیانوسەوە تاباكور
لەگەڵتانان.. لەگەڵتانان.

***

لەگەڵتانام..
دایكو باوكم لەگەڵتانە
زەیتونیشم، بۆی پرتەقاڵ
لەگەڵتانە..
سۆزو هۆنراوەكانیشمان
سەربازێكن لەكوشتارا.. لەپاڵتانان.
ئەی ئەوانەی وەك یاساوڵ
خۆر لەزنجیرو پێوەندی پیاوی ناپاك ئەپارێزن
تۆفو زریان.. لەیەكترمان دانابڕێ..
خەباتی نەتەوەكەتان.. خەباتمە
كەسوارێكتان لێ ئەگلێ
ئەڵقەی پەت لەملی منا..
ئەجەرپێنرێ.

-2-

"دەسا هەر بژی عوروبە"
سەلاحەددین!!
ئەی تۆ؟
ئەوە ئەسپەكەی تۆش گلا؟
ئالاكەی تۆش نەوی كرا؟
ئایا شمشێرەكەی دەستت
لەناو خاكی كوردستانا
لەو خاكەدا كەترسو سوتاندن تیایا
ئێشك ئەگرێ.،
ناوەشێنرێ؟.
"با هەر بمرن كرێكاران.،
ئەگەر وتیان.

ئیتر ئێمەش لەمەودواوە..
ئەڵێین: هەر بژی عوروبە.
ئەی عوروبە!
بەناو خاکی کوردستانا تێپەڕببە.
تێپەڕببە.. ئەوا دروێنەی هاوینە.
ئاخۆ ئەتوانی.. ببینی؟؟
نە ء،. نابینی
ئەگەر لەلولەی تۆپەوە تێ بڕوانی.
نەتەوەکەم!
پیاو خراپان پەلاماری
مێژویان دایت..
بەناوی تۆو عوروبەوە
خوێن ئەڕێژرێ
ئێستا پێڵاو فەرمان ڕەوایی تۆ ئەکا..
بەناوی تۆو عوروبەوە
لەڕۆخی دیجلەو فوراتا
مێژو ئەدەنە بەر چەقۆ
نەتەوەکەم!
ئیتر ئەوەندەمان بەسە
بالە خۆیان و تابوریان بێ بەری بین.
نەتەوەکەم!
دوژمنانت توڕدەرە ناو
سەرەنوێلکی پیسی ڕۆژگار
هەتا وەکو ڕومان ببێ
بڵێین: هەر بژی عوروبە
نەك لەسەر لاشەی مردوان
بڵێین: هەربژی عوروبە.

-3-

ئەی شەهرەزاد!
شەوگار.. ڕاوی بەیان ئەکا
باخەکانی کوردستانیش
وەرزێکی پڕ ژان و زامن
خۆشەویستی و
چرپەو هەواڵی دراوسێ
قەدەغەیە.
تەنیا ئەوەی کەڕەوا بێ
"خوێنی کوردە..
بۆتە نەوتی هەڵگیرسانی
ئاگردانی کینەو ڕقیان"
نەوتی چرای ڕیسواییان
لەمەرگی خەڵکی تردایە
ئەی شەهرەزاد!
داستانی پڕ قارەمانی
لەشەوانی خەونی خۆشتا



سەراپا ژەنگی هەڵهێنا
یادگارو.. ئەو جوانوەی
بەسەر کێوی چەقۆو ڕما
هەڵ ئەزنێ..
خۆشەویستی و.. ئەو شمشێرەی
لەتێکۆشان وازی هێنا
سەراپا ژەنگی هەڵهێنا.

***

شەرمەزارییە بۆ بەغدا
کەتەنیا شت تیاڕوا بێ
"خوێنی کورد بێ.."
لەڕادیۆدا..
لەڕۆژنامەی بەیانیدا
ڕەنگی لاپەڕەی ڕۆژنامە.. لەم شارەدا
ئاودامان خڵتانی خوێنە
سەرنیشانی هەواڵ تیایا
وائەنوسرێ:
"سەرجەم قەڵاچۆمان کردن"
ڕەوەی گورگ شانازی ئەکاو
لەخۆشیدا هەر بزەی دێ.
"ئەم خاکی کوردستانەمان..
کێڵا.. بست بست گۆڕمان تیا چاند"
"بەهەزاران.. کەللەسەرمان..
بێ ژمارە.. لەناویا چاند"

***

ئەی شەهرەزاد!..
شەوگار.. ڕاوی بەیان ئەکا
خۆشەویستی قەدەغەیە
پێخەفی نەرم و نیانت
لەبەر پێی گەورەی چەپەڵتا
توڕ دراوە..
سێلاوی خوێنی کوردستان
خوێن ڕێژانی ئەخنکێنێ
هەر کەسێکیش کەیاری بەئاگر بکا
لەئەنجاما ئەبێ هەر خۆی بسوتێنێ
ئەی شەهرەزاد!..
تەنیا هەر ئەوانە ئەمرن
کەچرای شەویان بەنەوتی
خەڵکی تر هەڵئەگیرسێنن..
ئیتر خوات لەگەڵ هەتاکو
چیرۆکی چەرخی داهاتو
چەرخی.. بازوی شۆڕشگێڕان
دیوارەکانی هەڵئەچنێ.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ

# جەلالی میرزا کەریم دا

ئامادەکردنی
عەتا قەرەداخی

جەلالی میرزا کەریم یەکێکە لەو پێنج ئەدیبەی کەلەئەنجامی هەستکردن بەبەستەڵەکیو خامۆشی لە بواری ئەدەبی کوردیدا،ساڵی حەفتا بەیانی (روانگە)یان دەرکردو بەردێکیان هاویشتە نێو گۆمە بەستووەکەی ئەدەبی کوردییەوە بۆ شکاندنی ئەو سەهۆڵبەندانەو شڵەقاندنی.

کاك جەلال ساڵی 1937 لەسلێمانی لەدایك بووەو لەناوەڕاستی شەستەکانەوە دەستی داوەتە شیعر بڵاوکردنەوەو لەدوای بەیانی ئازارەوە هەتا دەست پێکردنەوەی شەڕ لەساڵی 1974دا لەبواری ڕۆژنامەگەریدا کاریکردووەو ڕۆڵێکی دیارو لەبەرچاوی هەبووە.

پاش هەرەسی ساڵی 1975 چۆتە هەندەرانو لەئەمەریکا گیرساوەتەوە. لەم دواییانەدا گەڕایەوە باوەشی کوردستانی ئازاد. ئێمەش بەهەلمان زانی ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا سازبدەین.

1992 /7 /1

***پرسیار*** / لەدوای روانگەوە چەند دەنگێك چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرا کەببنە دەنگی بەرزو سەدادار بەتایبەتی لەشیعردا.. بەڵام لەباری یەکەمدا زۆرێك لەو دەنگانە زوو کپ بوونەوە، دوای کۆچی هەندێکی تریشیان بۆ دەرەوە.. دەرەوە بەتایبەتی ئەوروپا بۆیان بوو بەقەسابخانە، یان باشتر بڵێین ئەوروپا بووە قەسابخانەی شیعری کوردی، لەبۆچوونی منەوە تاکو ئێستا لەونەوەیە شێرۆکۆو ڕەفیق سابیر لەدەمی کێردەکانی ئەو قەسابخانە یان لەفشاری شارستانێتی ئەوروپا ڕزگاریان بووەو توانیوویانە بەزیندویی بمێننەوە.. جەنابتان ئەمە چۆن دەبینن؟

جەلال/ ڕەنگە ئەمە حوکمێکی ئاسان نەبێت. حەزدەکەم ڕایەکان ڕای ڕەها نەبنو بڵێین هەموو ئەوانەی وڵاتیان بەجێهێشتووە لێ چوونەتەوە نەخێر باحوکمدانەکەمان ببەستینەوە بەباری ژیانی ئاوارەییو خودی کەسەکان خۆشیانەوە.

بەگوێرەی خۆم لەگەڵ چوونە دەرەوەدا لەگەڵ مەسەلە فیکریو سیاسیەکەی کورددا بوومو ئەمەش لەشیعرەکانمدا ڕەنگی داوەتەوە. پێشتر لەگەڵ ڕوانگەدا بووم، هەر بەم هەستو نەستەوە چوومە دەرەوە، لەدەرەوەش هەردەم ئاواتەخوازی ئەوە بووم کەبگەڕێمەوە نێو بزوتنەوەی ڕزگاری خوازانەی میللەتەکەم بەڵام بۆم نەڕەخسا، دیارو ئاشکرایە زۆربەی ئەوانەی چوونەتە دەرەوە بۆ ئەوروپا و ڕۆژئاوا واتە بۆ دنیایەکی نوێ، لەوڵاتێکی وەکو ئێمەوە بچیتە ئەوروپای شارستانێتیو تەکنۆلۆژیا بێگومان ئەو دنیا نوێیە کاریگەری خۆی دەبێت ئیتر بەئیجابی بێت یان سلبی، ئەوەش بەندە بەهەر کەسێك خۆیەوە، زۆر کەس هەن بەکاریگەری ئیشکردنی سیاسی چوونەتە دەرەوە، بۆ نموونە ئێمە ساڵی 1976 نزیکەی هەزار کەس لەم ژمارەیە لەکاری سیاسیو ئەدەبیشدا هەن جیدی بوون، دیارە ئەمانەش باری ژیانیان باشتر بووە، ئەگەر کەسێك سەرقاڵی مەسەلەی ژیان بێت بەزەحمەت دەیپەرژێتە سەر مەسەلەکانی تر. لەو ژمارەیەی باسم کرد کەس هەلی ئەوەی بۆ ڕێنەکەوت بە (لاجیء) وەربگیرێت یان بخوێنێت. ئەمە بەگوێرەی ئەمەریکا، بەڵام لەئەوروپا زەمینەیەك هەبوو بۆ چوونە ناو بزوتنەوەی ئەدەبیو سیاسیشەوە.

لەبەرئەوە لەئەوروپا ئەگەر یەکێك چووبێتە بواری ئیشکردن یان گەڕابێتەوە بۆ کارکردنی لەبواری ئارەزووەکانی خۆیدا ئەوا سەرباری خودی تایبەتی ئەو کەسانە خۆیان بارودۆخ لای ئەوان لەئەمەریکا باشتر بووە، هەندێك لەوانەی کەلە ئەمەریکا بوون، ئەگەر لەئەوروپا بوونایە بەرهەمدارتر دەبوون، ئەوانەی ئەوروپاش ئەگەر لەشاخ بوونایە بەرهەمیان لەوەی ئەوروپایان زیاترو باشتر دەبوو.

من بۆ خودی خۆم وادەزانم دەبوا هەر لەکوردستان بوومایەو بەشداری



ئێش و ژان و بزوتنەوەی ڕزگاری خوازانەی گەلەکەمم لە نزیکەوە بکردایە ئەگەرچی لەدەرەوەش هەر دابڕاو نەبووم.

*پرسیار*/ سیاسەت و ئەدەب لێك جودا نابنەوە بەم پێیە ئەدەبی کوردیش مەحکومە بەوەی لەپانتایی سیاسەتدا کاربکات و بخولێتەوە، یان ئەو پانتاییەی ئەدەبی کوردی ئیشی تێدا دەکات پانتاییەکی سیاسی بێت، لێرەشەوە ئەدەب ڕووبەڕووی گرفتێك دەبێتەوە، گرفتی نەتوانینی دروستکردنی پرسیاری ئەدەبی لەپانتاییە سیاسیەکەدا، ئەمەش وایکردووە کەدەقەکانی ئەدەبی کوردی زۆرێکیان ببنە دروشمی ڕەونەقدارو دەقی تاسەر ئێسقان مردوو– ئەمە بەلای جەنابتەوە چۆنە؟

جەلال/ ئەمە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەدیبەکە خۆی. ئێمە دەبێ بەجۆرێکی تر بپرسین ئایا دەبێ ئەدیب ئینتیمای حیزبی هەبێت یان تەنها خاوەن ئینتمای فیکری بێت؟ بەلای منەوە ئەرکی ئەدیب جگە لەگرنگی دان بەڕووی هونەری و بەرەو پێشەوە بردنی دەبێت گرنگی بەلایەنە سیاسیەکەش بدات بەواتا دەبێت ڕووی هونەری و سیاسەت لەئەدەبەکەیدا هاوجووت بن، بەڵام دەتوانم کاری ئەدیبێك و سیاسیەکی ناو ڕێکخستنی حیزبایەتی جیابکەمەوە. کاری سیاسیەك جیاوازە لەکاری ئەدیبێکی مونتەمی بۆ فیکرەیەکی دیاری کراو، بەڵێ دەبێ ئەدیب فیکری پێشکەوتن خوازانەی هەبێت نەك هەڵگری فیکری حیزبێکی دیاری کراو بێت، هۆی ئەمەش ئەوەیە کەئەدیبێك ناتوانێت لەسیاسەت ئەدەب دروست بکات چونکە ئەدیبەکە خۆی دووچاری ئینتیمای سیاسی کردووە، بەڵام ئەگەر توانی خۆی لەو ئینتیمای سیاسیە ڕزگار بکات ئەدەبەکەشی دەبێتە ئەدەبی هەموو نەتەوە، ئەدیب ئەگەر لەحزبێکدا بێت ئەدەبەکەشی پێدەچێت ببێتە دەنگی ئەو حیزبە.

بەڵام ئەرکی ئەدیب و ئەدەبی دەبێت زۆر لەسیاسەت و لەسیاسیەکان گەورەتر بێت، خۆ ئەگەر ئەدیب ئینتیمای حیزبیشی هەبوو ڕەنگە ئەگەر لەئەڵقەکانی خوارەوەی حیزبدا بێت زۆر مەترسی دار نەبێت، بەڵام ئەگەر نزیك بوو لەسەرکردایەتیەوە ئەوە ترسناکترە چونکە ئەدەبەکەی دەبێت بەدەنگی بەڕێوەبردنی حیزبەکەی. بۆ نموونە ماوتسی تۆنگ کاتێ سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی چین بوو شیعریشی دەنووسی بەڵام سەرجەم شیعرەکانی لەسنووری بەیان و بەرنامەی حیزبەکەیدا بوو ئەمەش بەگوێرەی ئەدەب ترسناکە.

من لەبرادەرانی خۆم (ئەنوەر شاکەلی) لەسویدەوە نامەیەکی بۆ ناردم بۆ ئەمەریکا تیایدا دەڵێت: واز لەسیاسەت بهێنە چونکە سیاسەت ئەدەبەکەتی کوشتووە "زۆر چوونە ناو سیاسەتەوە لەبەرهەمی ئەدیب کەم دەکاتەوە.

*پرسیار*/ وەکو شاعیر نزیکەی (25) ساڵ دەبێت خەریکن بەپێی ئەو ماوەیە خاوەنی بەرهەمێکی کەمن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە تاکو ئێستا لەشێوەی دیوانێکدا هیچتان نەبینراوە، دەبێ هۆی ئەمە چی بێت؟

جەلال/ پێش چوونە دەرەوە بەرهەمەکانم لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکردەوە، دوایش ویستم بەناوی :کاروانی وشەی ڕاچەنیو" چاپیان بکەم. کۆمکردۆنەوەو محەمەدی مەلا کەریم پێشەکی بۆ نووسین، بەڵام سەرەتای ساڵی (1974) دامە سانسۆر پەسەند نەکرا، پاشان بەڕێگای ناشەرعی وەکو دەڵێن، لەچاپخانەی (برایەتی) بەشی زۆریم کردە فلیم و بەشێکی کەمی مایەوە.. ئیتر چوونە دەرەوەی بۆ شاخ بەسەردا هات و ئەو بەرهەمە بەجێما، ڕاستی‌یەکەی تاکو ئێستاش ئەو شیعرانەم لای برادەرێکن لەبەغدا، لەدەرەوەش لەگۆڤارو بڵاوکراوەی ئەدەبی و لەبڵاوکراوەی حیزبەکانیشدا شیعرم بڵاوکردۆتەوە. بەشێکی زۆری شیعرەکانم کراونەتە عەرەبی دوو شیعریشم بەئینگلیزی نوسیووە، یەکێکیان لەبڵاوکراوەیەکی ئینگلیزیدا لەو قوتابخانەیەی لێم دەخوێند بڵاوبووەوە، پاشان ویستم ڕۆژنامەگەری بخوێنم بەڵام بۆم نەچووە سەر لەبەر تەمەن و هۆی تریش. دیارە زروفی ئەمەریکاش ئەوەندە لەبار نی‌یە بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە چونکە ژمارەی شیعر دۆستانی کورد گەلێك کەمن لەوێ. نەشم دەتوانی شیعرەکانم بەچاپکراوی بنێرمەوە وڵات چونکە زۆری دەویست، ئێستاش خەریکی ئەوەم هەموو شیعرەکانم ڕێك بخەمەوەو بیان خەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست، گەرچی زۆرێکیان لەڕووی هونەرییەوە دەستکاریان دەوێ و هەندێکیان ونبوون و تەنها ئەوانە ماونەتەوە لەبەرهەمی کۆنم کەلەساڵی 1974– 1975 لەئێزگەی شۆڕش تۆمار کراون. دواجار لەنووسەری کوردستانی چیاو خەرمانەو ڕێگای ئاشتی و سۆشیالیزم شیعرم بڵاوکردۆتەوە.

*پرسیار*/ ئێستاش هەر پێشنیارێ هەر شتێکت هەبێت بیفەرموویت؟

–تەنها خۆشی و سەرفرازی نەتەوەکەم دەخوازم و سوپاسی ئێوەش دەکەم کەبەسەرتان کردمەوە.

–ئێمەش دیسان بەخێرهاتنەوەت دەکەینەوەو.. سوپاس.

---

# جەلالی هاوڕێم

حسین عارف

بەڕێزان..

بێگومان زۆر زۆرن ئەوانەی بەدرێژایی ڕۆژگار، دێنە دنیاوەو لێی دەردەچنەوە. بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی کاتێ لێی دەردەچنەوە، هیچ نەبێ جێپەنجەیەکیانی پێوە دەمێنێتەوەو، یادگارێکی بۆ نەوەکانی دوای خۆیانی تێدا جێدەهێڵن.

هاوڕێم جەلالی میرزا کەریم، چ وەك مرۆڤێکی تێکۆشەر لەپێناوی بیروباوەڕێکداو، چ وەك شاعیرو ڕۆژنامەنووس و ڕۆشنبیرێك، یەکێکە لەو زۆر کەمەی کەهەردەم وەك ئەستێرەیەکی گەش، لەیادی نەوە لەدوای نەوەی گەلەکەماندا دەدرەوشێتەوە. ئەمە ڕاستییەکەو داستانی ژیانی خۆی دەیسەلمێنێ، کەمن ڕەنگە تەنیا چەند لاپەڕەیەکیم ئاگا لێبێ و لەم بۆنەیەدا، وەك چەند سەرەقەڵەمێك بیانخەمە بەرچاو. چەند لاپەڕەیەك کەهاوشانی یەکتر، ڕۆژو مانگ و ساڵانی تەمەنمان پێکەوە بەکۆڵەوە گرتوەو، لەخۆشی و ناخۆشی و پێکەنین و گریان و شادی و خەفەتباری و سەرکەوتن و شکستخواردندا، پێکەوە بەکێشمان کردوون.

ئەوەتا خۆمان دەبینم، بووینەتە دوو هاوڕێی سەرەتای تەمەن. دوو لاوو کورد واتەنی: بۆنی شیری خاو لەدەممان دێ.. دوێنێ پێرێیەك پلەی خوێندنی سەرەتاییمان بڕیوەو، هاتووینەتە پلەی ناوەندییەوە، کەچی ئەرکی هەرەسپێهێنانی جیهانێك و بنیاتنانەوەی جیهانێکی ترمان لەجێگەی، لەئەستۆ گرتوە!. ئەوەتا هاوڕێم جەلال دەبینم، هەر ڕۆژێك کەدەچێتە قوتابخانە، خەمی گەورەی دواندنی ئەم هاوەڵ یائەو هاوەڵێتی، تا بیروباوەڕەکەی خۆی پێڕابگەیەنێ و لەگەڵ خۆیدا، بیخاتە سەر ڕێگای سەختی تێکۆشان. یالە عەسرەکەیدا دەیبینم، خۆی بەیەکێ لەکۆڵانەکانی گەڕەکێکی شاردا دەکا. دوای دڵنیا بوون، ئاودیوی دەرگای خانوویەکیان دەبێ. زۆری

پێناچێ کۆڕی گفتوگۆ، لەسەر چۆنێتی هەرەسپێهێنانەکەی ئەم جیهان‌و بنیاتنانەکەی ئەو جیهانەکەی تر گەرم دەبێ.

یائەوەتا دەیبینم شەوەکەی، دەوری بەکاغەزی تەنك‌و کاربۆن‌و قەڵەمی کۆپی تەنراوەو لەبەر کەمیی توانای چاپەمەنی، تاخەو دەیباتەوە هەر دەنووسێتەوەو دەنووسێتەوە. ئینجا دەیبینم لەبەرەبەیانێکی زوودا، بندەستێك بەیاننامەی سەبارەت بەهەرەسپێهێنان‌و بنیاتنانەوەکەی پێیەو، بەکووچەو کۆڵان‌و شەقام‌و ناو بازاڕەکانی شاردا بڵاوی دەکاتەوە. دواجار بۆ ڕۆژی دوایی دەیبینمەوە، لەقوتابخانە قۆڵی لەقۆڵی هاوەڵێکی تردایەو هەوڵ دەدا، مرۆڤێکی تر بخاتە سەر ڕێگا سەختەکەی تێکۆشان. بەڵێ.. هاوڕێم جەلالی لاو، بیست‌و چوار سەعاتەکەی شەوو ڕۆژی ئەو تەمەنە فەریکەی، وەها دەخستە قەبەڵی گرتنەبەری ئەو ڕێگا ستەمەوە.

بیست‌و چوار سەعاتی پڕاوپڕ لەخەباتی سیاسی‌و حیزبایەتی‌و، ئەوە دەبوو وەها بگەیەنێ کەنەیپەرژێتە سەر بیرکردنەوەی ئاوڕدانەوە، لەجۆرێکی تر لەچالاکی لەژیانیدا. کەچی نەء.. شانبەشانی ئەویان‌و هەر لەو تەمەنە زووەشیدا، مەیلە ڕەسەنەکەی تریشی کەبۆی خوڵقاوە، سەری لێهەڵدەداو ئەوەتا وەك دوێنێ بێ لەبەرچاومەو خۆمان دەبینم، دوو قۆڵی شانمان داوەتە بەر بەجێهێنانی ئەرکێکی هەم مرۆڤپەروەری‌و هەم ڕۆژنامەگەریی ساکار.. تەنیا دوو قۆڵی‌و وەك زەفەربردنێکی خودی خۆمان بەخوڵقاندن‌و داهێنان، لەبواری بیروباوەڕەکەماندا.

ئەوەتا بەلایەنە مرۆڤپەروەرییەکەدا، دۆستایەتیمان لەگەڵ ژمارەیەك لەحافزە نابیناکانی شاردا پەیداکردوەو، لەڕێگەی خەتی (برایل)ەوە کەجۆرە نووسینێکی تایبەتە بەوان، فێری خوێندنەوەو نووسینیان دەکەین‌و ئەگەر درێژەی باسەکە بگێڕمەوە، داستانێکی لێپێکدێ. ئینجا بەباری ڕۆژنامەگەرییە ساکارەکەدا، ئەوەتا خۆمان سەرقاڵی دەرکردنی گۆڤارێك بەدەسخەت بەناوی (رووناکی)یەوە کردوە، کەسەبارەت بەوانە بۆ چاوساغان. دیارە ئەمە یەکەم چەکەرەی ئارەزووکردنی هەردووکمان بوو، بۆ چوونە ناو جیهانی ڕۆژنامەگەرییەوەو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی *953* یا *954*.

ئینجا نۆرە دێنمە سەر ئەلبوومی وێنەکانم. ساڵ هەر *953*و *954*ە. ئەوە (چەقڵاوە)ی لەمەڕ تانجەرۆی هەم سەیرانگاو هەم بارەگامانە. ئەوە هاوڕێم جەلالە کەبەشدارێکی بەردەوامی زۆربەی سەیرانەکانە. بەڵێ.. هەم بۆ سەیران دەچین‌و هەم لەوێ، هەموو جار سیمینارێك بۆ جۆرەها چالاکیی ڕۆشنبیری سازدەکەین، کەئەو هەردەم کارسازێکی چالاکێتی. لەسەر وێنەکان بینایی ڕاگیر دەکەم. لەوە دەکەون تەنیا وێنەبن. دبنە دیمەنی زیندوو زیندوو. دەبنە من‌و جەلال‌و جەلال‌و یەکبەیەکی هاوڕێیانی ئەو سەیرانگاو بارەگایە. دەبنە جەلال‌و ئێمەو چەقڵاوەی پڕاوپڕ لەژیان.

ڕۆژو مانگ‌و ساڵان دەسووڕێن‌و، بەرودوا بەرگرتن‌و زیندانیکردن دەکەوین. من هەڵدەدرێم بۆ (شوعەیبە)ی لای بەسرەی هەم سەربازگەو هەم بەندیخانە. ئا.. ئێستا من لەوێم‌و ڕێگای گڕوگاڵکردنی نووسین‌و بڵاوکردنەوەم گرتۆتە بەرو، دوو سێ وتارێکم لەڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاودەبێتەوە. کەچی لەناکاوێکدا، نامەیەکم لەهاوڕێم جەلالەوە پێدەگا. دەبینم نامە لەشارۆچکەی (بەدرە)ی شوێنی دوورخراوە سیاسییەکانەوە هاتوە. کاتێکیش دەخوێنمەوە، سەیر دەکەم نامە لەئەدەب بەگشتی‌و لەوتارە بڵاوکراوەکانم بە تایبەتی دەدوێ. کەواتە ئەویش ڕێگای گرتۆتە بەر.

دیسان ساڵ دەسووڕێ‌و وا، وەرچەخانە گەورەکەی تەمووزی (*1958*)ە. وا لەگەڵ هاوڕێم جەلالدا، لەسلێمانی یەکدگیردەبینەوەو واهەمدیس‌و بگرە بەپەرۆشترەوە، ڕێگای هەرەسپێهێنان‌و بنیاتنانەوەکەمان گرتۆتەوە بەر. ئەوەتا دەیبینم کڵپەیەکە لەچالاکی‌و سرەوتدانی بۆ نییە. تەنانەت شانبەشانی چالاکییە سیاسی‌و حیزبایەتییەکە، چەکی قەڵەمیشی خستۆتە کارو دەنووسێ‌و بگرە، ئەرکی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکیشی بۆ قوتابیان لەئەستۆ گرتوە.

لەگەرمەی ڕووداوەکانی وەرچەرخانە مەزنەکەدا، من فرسەت لەتەواوکردنی خوێندن دێنمەوەو، خۆم دەگەیەنمە پلەی زانکۆ. بەڵام مخابن ئەو ئەم هەلەی بۆ ناڕەخسێ. لەوەبەدوا ئیتر ڕۆژگار بۆ چەند ساڵێك لەیەکترمان دابڕدەکا. کاتێ من بۆ خوێندن لەزانکۆ دەکەومە بەغدا، ئەو لەسلێمانییە. کەمن دێمەوە سلێمانی، ئەو لەبەغدایە. بەڵام لەئەنجامدا منیش دەکەومە بەغداو، سەرلەنوێ یەکدگیردەبینەوەو لێرەوە ئیتر هاوڕێم جەلال، وەك شۆڕەسوارێکی مەیدانی ئەدەب‌و ڕۆژنامەگەری‌و ڕۆشنبیری دەبینم. ئێستا بۆتە سکرتێری نووسینی گۆڤارێکی ئەدەبی‌و لەیەکەم ژمارەیەوە، جێپەنجەی ڕەنگینی خۆی تێدادەنەخشێنێ. ڕۆژانەش یەکتر دەبینین‌و لەگەڵ هاوڕێیانی ئازیزمان، شێرکۆ بێکەس‌و کاکە مەم بۆتانی کەڕێکەوت هەر لەو ماوەیەدا ئەوانیشی هاویشتۆتە ناو بەغداوە، کۆڕی دەمەتەقێی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری بۆ خۆمان گەرم دەکەین. جارجارێك هاوڕێی ئازیزمان جەمال شاربازێڕیش دەبێتە پێنجەممان. سەعات‌و دووان‌و سیان‌و زیاتریش، وەك هەریەکەمان کانییەك بووبێ‌و ساڵەها بێ، بەری لێگیرابێ‌و دەستێکی تەلیسماوی لەناکاوێکدا بەری بەرەڵا کردبێ، هەر دەدواین‌و هەر دەدواین‌و کۆتایی بەلێشاوی لێدوانمان نەدەهات. تاگەیشتینە ئەو ئەنجامەی کەئێمە، دەورو خولی گۆمێکی مەند دەدەین‌و دەبێ، بەردێکی تێبهاوین‌و بیشڵەقێنین.

بەڵێ.. ئەوەتا بەردەکەمان ئامادە کردوە. بەڵام ئایا کێ ڕێگا بۆ هاویشتنەکەی خۆش دەکا؟!. کێ بواری بۆ دەسازێنێ؟!. جەلال.. دەبێ لەجەلال بەولاوە کێی ترمان هەبێ؟!. ئا.. ئەو بەردەکەی بەسەرسنگییەوە گرت‌و چوو، هاویشتییە ناو گۆمەکەوەو بواری بڵاوکردنەوەی، بۆ بەیاننامەکەمان ڕەخساندو ئیتر لەو ساتەشەوە هاوڕێمان جەلال، بووە کۆڵەکەیەکی سەرەکیی بزووتنەوەی ڕوانگەو، قورسایی بەشێکی گەورەی ئەرکەکە، بەسەر شانی ئەوەوە بوو. ئەو بووە کارگێڕی بنکەو بارەگای ڕوانگە. ئەو بووە ڕێگا خۆشکەری بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی. من بەچاو ساغیی ئەوو پێکەوە، ڕێگای نەجەفمان بۆ لەچاپدانی گۆڤارەکەمان دەگرتەبەر. بەکورتی ئەوبوو خەمخۆری گەورەی ڕوانگە.

دیسان ساڵ دەسووڕێ‌و ئەژدیهایەکی حەوتسەرمان لێپەیدا دەبێ. ڕاومان دەنێتە سەر ترۆپکی چیاکان. لەوێش دەست لەیەخەمان بەرنادا. لەگەڵ هاوڕێم جەلالدا لەیەکترمان دابڕ دەکا. ئەو لەوپەڕی دنیا دەگیرسێتەوەو من لەمپەڕی. ئەو حەڤدە ساڵی ڕەبەق، لەگێژاوی خەمی دوورە وڵاتیدا لوول دەخواو حەسرەت دڵی دەپروێنێ. بەڵام هیچ نەبێ حەسرەتەکەی لەوێ لەگەڵ خۆیدا نەناشت‌و هاتەوە، بەدەم خەندەی شادبوونی بەئازادی و سەربەستییەوە، دوا هەناسەیدا.

دواجار دەیڵێمەوە.. زۆر زۆرن ئەوانەی دێنە دنیاوەو لێی دەردەچنەوە. بەڵام کەمکەمن ئەوانەی کەلێی دەردەچنەوە، جێپەنجەیەك لەدوای خۆیان جێدێڵن‌و هاوڕێشمان جەلال، یەکێکە لەو کەمکەمەو لەیادی نەوە لەدوای نەوەی گەلەکەماندا دەژی.

**ئەم وتارە لەچلەکەیدا خوێنراوەتەوە لە سلێمانی**



# "جەلال"ی شاعیرو مرۆڤ..
# "جەلال"ی نوێخوازو ئازادیخواز..

**شێرکۆ بێکەس**

سلێمانی ئەوسا، سلێمانیەکی باریکەلەی ئێسك سووکی چاوگەشی هەنیە ئاڵی پلوپێ بچکۆلەی پۆشاك ساکاری بەرکاوی زەنەکی "گۆیژە" بوو. شار وەك ئێستە ئاوا قژبژ نەبوو هەناسە سوارو بەژاوەژاوو دەمارگرژو ورگیشی دانەدابوو. بەسانایی سنوورەکانی نێوان خۆشەویستیو ڕقو، گوڵو دڕكو، بەفرو ڕەژووت لەیەکتر جویێ ئەکردەوە. ئەو دەمە لەم شارەداو لەبنەبانی چایخانەکەی، بەهەشتیی، خوالێخۆش بوو "حەمە ڕەق"داو لەسەر چەند قەنەفەیەکی تەختەی درێژکۆلەی دەسك قۆقزوو گرنج گرنج.. بەدەوری حەوزێکی شەش گۆشەیی خشت بەندا کەپرشە پرشی هەڵچووی فوارەکەی بەردەوام تۆپێکی باغەی سپی لەسەر سەری خۆی تەوق ئەکرد.. لەوێدا.. دەستەیەك قوتابیو خوێندکاری، زۆرجار دەفلسی چا پێنەبوو، پانتۆڵ لەلوولە زۆپا چووی ئوتوو نەدیو.. کۆمەڵی لاوی خوێن لەئاگر گەرمتری سەر پڕ لەهەورە برووسکەی ئازادیی، دائەنیشتنو، سەری ڕازو چرپەو نەهێنیيان ئەنا بەسەری یەکەوەو.. منی تەمەن شانزەو حەڤدەیش تازەبەتازە سەر لەهێلکە جووقاوی شیعرو سیاسەتو ڕۆژنامەی "ژین" بەدەستەوە گرتوو،، وەك کەروێشکێکی بزۆزی بەر دەرکی لانە، هەر چاوە چاوو ملەقوتێم بوو، تێ ئەگەیشتمو تێ نەئەگەیشتم، منێك کەلەو دەمەدا بەبۆنو بەرامەی گوڵاوی خۆشەویستی باوکمەوە ئەناسرامەوە،، ئەمەیش بۆ تازە کوورەی شیعرم، تینو تاوو گوڕێکی- ئەفسانەیی پێ ئەبەخشیم- لەو سەردەمەدا، کاك "فەرەج



ئەحمەد"ی کوڕی لەگوڵ پاکتری ئەم شارە، کوڕی تائەمرۆ ژیاو بەمل کەڵیو دەروون هەژاریی، کوڕی قسەخۆش وەك ئەحەی کڕنووی باپیرە گەورە، چرای بەشەوقی ئەو کۆڕانەو ڕێبەرێکی سەرچڵو هۆشیاری نێو بزووتنەوەی قوتابیان بوو.

بیرمە: دەمەو عەسری سەرەتای بەهارێکی تەڕو پاراو، دەستەیەك بووین، لە "مەولەوی"یەوە، بەرەو باخی گشتیی، باخە گەورەکەی شار- شۆڕ ئەبووینەوە، هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە- کاك فەرەج وتی:

-ئەمیش کاك "جەلالی میرزا کەریم"ی برادەرمان، سبەینێ ئەمیش لەسەیرانەکەی "چەقلاوە" شیعر ئەخوێنێتەوە- دوای ئەوە ئێستێکی کەمی کرد- و بە لاچاوێکیش ڕوانییە کاك جەلال- وتیەوە: پەنجا فلسی لۆریەکەیش ئەو بۆت ئەدات!!

ئەوە یەکەم جاربوو پەنجەکانی دەستی منو دەستی جەلال یەك بناسن وتێك ئالاێن.. یەکەم جاربوو گلێنەمان بچێتە ناو گلێنەی یەکترەوە.. یەکەم جاربوو زەردەی زەردەخەنەمان ئاوێتەی یەك بێن...

لێی وردبوومەوە: لاوێکی موو زەردی، ئێسقان پانی- پێست سورو سپی، قژکاڵی لووت بەرانیی، چەناگە گردی- چاو تۆزێ بەقوڵدا چووی باڵا مام ناوەندیی هێمنو ڕۆح سووك بوو... ئیتر بۆ ڕۆژی دوایی- لەگەڕەکی سەرشەقامو لەپێچێکدا.. دوو لۆری بارهەڵگری گەچاویی، پشتەکانیان دادایەوەو ئێمەیش لەگەرووی چوخمو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی ئەم بەرو ئەو بەرەوە پەیدابووینو دەس بەپریاسکەو سەفەرتاسیەوە خۆمان هەڵدایە سەرەوەو هەڵتەك هەڵتەك کەوتینە ڕێو گەیشتینە چەقڵاوە..

چەقڵاوە،، ئەم ناوە لەیاد مەکەن!.

ئەم ناوە بێشکەیەو کوانووەو مێژووە.

چەقڵاوەی ناو گوڵە هێرۆکانی نزیك بەئاوی ڕەوانی تانجەرۆی گیانی نالی،، ئەم جێ نزرگەی ئازادیيە، لەناوەڕاستی پەنجاکانەوە تاشۆڕشی تەمووز، بووبوو بەشانۆیەکی نهێنی بۆ وشەی قەدەغەو نەورۆزی قەدەغەو ئاگری قەدەغەو.. ئاگردانێکی بەکڵپەش بوو بۆ بزووتنەوەی خوێندکارانو قوتابيانو ئازادیخوازانی شار.

چەقڵاوە.. چەقڵاوە..<br>
قوتابخانەی وشەی شۆڕشگێڕ..<br>
یانەی بەهرەی ئەدەبیی..<br>
کێڵگەی وتارو<br>
سەکۆی شیعرو<br>
دەشتی دیموکراتیو مێرگێکی سیحراویو<br>
هەر هەموو دڵدارانیشی لەسەد سەدو پەنجا<br>
عاشقێ، سەودا سەرێ، تێنەئەپەڕین.<br>
لەوێوە دوو ئاوانی گیانی منو جەلال<br>
تێکەڵی یەك بوون..<br>
لەگوڵە هێرۆکانی چەقڵاوەوە<br>
فێری خۆشەویستیی بووین..<br>
بەبۆنو بەرامەی مۆردو ڕەشە ڕێحانەی<br>
گوێ جۆگەکەی ئەوێ<br>
کاکۆڵێ وشەو قژی قەڵەممان بۆندار بوو.<br>
"جەلال" بەر لەمن<br>
ئاوێزانی شیعر بووبوو، بەر لەمن<br>
بەتیشکی حەرفدا هەڵزنا بوو..

بەر لەمنیش لەپەنجەرەکانی ڕۆژنامەی "ژین"ەوە
سەرە تاتکێی لەگەڵ کچە چاوڕەشەکانی شارو
گەڵاو گوڵدا کردبوو..
بەر لەمنیش چووبووە شانەکانی ڕاپەڕینەوەو بەر لەمنیش دڵی خۆی کردبوو
بەچەترو گومەزی هەژاران.
دیسانەوە بیرمە: ئەو ئێوارە غەمگینەی، کەتەرمی شێخی بەردە قارەمان گەیشتەوە دڵی شارو، ئاپووڕەی خەڵك هاتن و رووبارێکی خۆڵەمێشیی بەسام کەوتە مەوج دانەوە، بیرمە: چەند گەروویەکی ئازا، چەند هاوارێکی بڵێسەدار، چەند پەیڤێکی مێژوو هەژێنەر، دریان بەبێ دەنگی و دیواری خامۆشیداو، رووی ئاپوورەی گەلیان، بەرەو رووگەی کوردستان و شۆڕش و مەلیك مەحمودوو ئازادکردنی "شێخ لەتیف"ی کوڕ وەرگێڕا.. یەکێك لەو چریکانە لەگەرووی جەلالی میرزا کەریمەوە بازرەقەی بەست.. یەکێك لەو کڵپانەی کەئەو ئێوارە خۆڵەمێشییەی بەرەنگی سووری ئاگرینی رەنگ کرد.. کڵپەی بانگی بەلرفەی جەلالی میرزا کەریم بوو.
جەلال.. گۆمێکی مەنگ بوو.. بەڵام یاخیی
یاخیی بەرامبەر عەقڵی کۆنینەی چەق بەستوو..
بەرامبەر کۆت و پێوەند
بەرامبەر چوارچێوە باوەکان
ئەو ڕۆحی زەردەشتیکی نوێ بوو.. عاشقی
کرداری نوێ و وشەی نوێ و ژیانی نوێ بوو.
لەکۆتایی شەستەکانیشەوە.. تاسەرەتای حەفتاکان..
لەبەغدای "ئەبونەواس"و "شەهرەزادو"و "سەیاب"و
"حسێن مەردان"دا.. جارێکی دی شەوانە لەگوێ
دیجلەی مەست و نەمر بەبادەی بەهەشتیی "ئەڵقەی
نوێ خوازان" یەکمان گرتەوە.. ئەمجارەیان لەکلاوڕۆژنەی
شیعرو چیرۆکەوە سەرمان هێنایە دەرەوە.. بۆ
چریکەیەکی تیژترو یاخی بوونێکی گەورە تروو
زەنگ لێدانێکی بەهێزتر..
ئەویش چریکەی باڵندە سەرکەشەکەی ڕوانگەو
هاوارو یاخی بوونی ئەسپە سەرکەشەکەی ڕوانگەو
زمان و ئاخاوتنی و زەنگی فەرهەنگی نوێی ڕوانگە بوو.
لەبزووتنەوەی نوێی ڕوانگەدا.
لەو هەژێنە پڕ لە چەخماخەیەدا.
لەو بوولەرەی شیعرو چیرۆکەدا.. لەو دەمەدا..
"جەلالی میرزا کەریم" عەقڵێکی ڕۆشن و باڵێکی بەهێزو
دوو چاوی نەترس بوو.
لەو سەردەمەدا، کەهێشتا ترسی تێنەپەڕاندن لە ئەفراندنی "گۆڕان".. زۆر دەست و قەڵمی ئەلەرزان.. وێنەی شیعر لای جەلالی میرزا کەریم، پڕبوون لەبریسك و هووڕی سەرسامکردن.
زمانێکی یاخیی بوو.. لەفەرهەنگی خۆی.
درەختێکی یاخیی بوو.. لەدارستانی خۆی.
کێلانێکی یاخیی بوو.. لەخەنجەری خۆی.
ڕوانگە ڕاچڵەکێنێکی تربوو لەجەستەی ئەدەبی کوردیدا..
خوێنێکی تربوو.. لەدەماری وشەو داهێنانی تازەدا..
ڕاپەڕینێکی تربوو لەناو خودی زمان خۆیدا..
شکاندنی بەستەڵەك و ڕوخاندنی زۆر دیواری
تاریکیی ئەو کاتەبوو..

لەبارانەکەی ڕوانگەدا
جەلالی میرزا کەریم،،
شەوقدانەوەی برووسکەی پێش ناڵەو گرمەو داڕژان بوو.
لەگوڵجاڕی ڕوانگەدا
ئەو گوڵە لیمۆیەکی هێوری هەمیشە
دەم بەخەندە بوو.
وەك دەریاچەیەکی مەکس و ئارامیش
هەموو بەردێکی توانج و تیرێکی سەرزەنشتی
ناحەزان و نەیارانی لەقولایی خۆیدا
مت ئەکردوو سەرئەنجامیش
ئەو هەر رووە شینە درەوشاوە پاك و بێگەردەکە بوو.
هەر لەسەرەتای بەبزوێن و بەجم و جووڵ و پڕ لەخرۆشی
حەفتاکانیشدا بوو،، کەڕوانگە یاخیی بوو
لەکۆمەڵی چەق بەستن
لەشەختە بەندانی داب و نەریتی کۆنینەی هەناو کلۆر.
لەسەر ئازادیی ژنان و یەکسانی و بەرامبەرییان
لەسەر مافی سەر بڕراوی
ژێر عەباو پەچەیان
هاتە قسەو،، بوو بەمێژوویەکی تووڕەو
گەرداوی بانگەوازی "قەڵەمە نەترسەکان"ی هەڵکردوو
ئیتر ئاجووجوو ماجووجی شەوە زەنگ و
عەقڵی بەردیینی و قاژووەکانی مێژووی پیرۆڵکەی
لێڕاست بۆوەو،، لەهەر چوار لاوە،، کردیان
بەقرەقرو قاووقیژی ئەشکەوتی شەمشەمە کوێرە ئاساو
ئەوەبوو ناوی هەمووومان
ناوی جەلالی میرزا کەریمیش
کەوتە بەر ڕەجمی جەهالەت و
لەسەر دیوارەکانی شار پەتمان بۆ هەڵخرا،،
لەو ڕۆژەوە، لەو ڕەجمەوە، لەو دۆزەخەوە
جەلال و ئێمەیش،، بەهاو نرخی مرۆڤایەتی خۆمان باشتر دۆزیەوەو
بووین بەهاودەمی ئازادیی و
دەنگی سکی سووتاوی دایکان و
گەرووی هاواری ژنان و چراوگەی یەکسانی و
مافی.. چوون یەکیی،،
لەمێژووی ڕاپەڕیوی ئێمەدا..
لەبزووتنەوەی ئەفراندنی ڕوانگەدا
ئەو بەرەنگار بوونەوەی جەهالەتە
ئەو بەگژا چوونەوەی شەوەزەنگە
سەرەتای ڕاپەرینێکی فیکری نوێ بوو.
کە "جەلالی میرزا کەریم" چرایەکی گەشی پێشەنگی بوو.
دیسانەوە.. لەدوو ڕیانێکی تری مێژوومانا
ئەو کاتەی ئەسپی شۆڕشی ئەیلول حیلاندی و
سەنگەرەکانی هەتاو خوێنی داگیرسا و
کانیی هەڵقولاوی شوێنی ناپاڵم
ڕۆحی هەموو قوربانیەکانی
نۆی حوزەیران و سیارەو بادینان
داوای ئاگری قەڵەم و
باهۆزی شیعرو،، مەشخەڵانی چیرۆکیان ئەکرد

جەلالی میرزا کەریمیش
لەگەڵ کاروانی پشکۆکاندا بوو
لەگەڵ وشەی ڕاپەڕیوو
لەگەڵ گەردەلوولی ئەیلولدا بوو
بەغدای جێهێشت و گەیشتە لای هەڵگورد و کێوی
مامەڕووتەو بن دەوارێکی ئازادیی کرد
بەهەواری شیعرو قەڵەمەکەیی و تاکۆتایی
لەگەڵ نەڕەی پێشمەرگەو، گۆرانیی شوانکار
هاوڕێکانی خۆیدا بوو.
دوای نوشوستی شۆڕشی ئەیلولیش
لەشەوێکی غەمگیندا، کە نائومێدیی لێ ئەچۆڕایەوە..
لەبەر شەوقی چرایەکی کزداو لای ئەو دانیشتبووین
هەر هەمووشیان یەك پرسیار، پرسیارێکی توترك ئاسا
لەشانەکانی مێشك و گیان و دڵمانەوە ئالابوو:
چی بکەین؟!!
بیرمە: جەلالی میرزا کەریم لەسەرخۆ وتی:
–من بەرەو عێراق ناگەڕێمەوە..
ئەچمە ئەودیوو، لەودیویش نامێنمەوە..
ئەڕۆم زۆر دوور ئەڕۆم
من تازە چاوم بەرایی نایە
سەرتاپای خاکێ بەدیلی ببینمەوە!
هەر وایش بوو!.. جەلال وەك باڵندەیەکی سەرهەڵگرتوو
لەڕۆژێکی تەماویدا، لەشەقەی باڵی‌داو لەگەڵ هەموو زامە
گەورەو گچکەکاندا "وەك ئەستێرەیەکی خوێناویی" دوور
دوور،، فڕیو فڕی،، تائەو پەڕی دنیا،، تاوڵاتی
"جاك لندن"و تانیشتمانی "ئیدگار ئالان پۆ"و تاکەناری
ئۆقیانوسی ئارام،، نەنیشتەوە،،
ئیتر حەڤدە ساڵ ئەو
پەپوولەیەکی ناو ژیانی کۆنکرێتیی بوو.
ئاوازێکی نامۆی ناو شووشە بەندوو
کەنیسەیەکی هەمیشە بەشەوارە کەوتووی
بەر چراخانی غەریبی بوو.
حەڤدە ساڵ ئەو شەوانە
بەدیار خەونەکانی عومرەوە گریا..
بەدیار وێنەی خۆشەویستانەوە..
بەدیار شیعرو تەنیاییەوە..
تاراوگەیش بێ کازیوە بوو.
لەکوێرە ڕێکەوتنێکی ژیانیشیداو لەوڵاتی نامۆییدا
لەساتەوەختێکی غەفڵەتی زەماندا
هەر لەوێ.. ئوتومبیلێ جەستەی شێلاو
پەراسووەکانی تێك شکاندوو
سەرئەنجامیش نیوە لەشێکی بۆ مایەوەو
دەردی تاراوگە گرانترو
تەنیایش تەنیا تربوو.
دۆزەخ بەدوای دۆزەخدا هاتن و ڕۆیشتن.
خوێن بەدوای خوێندا هاتن و ڕۆیشتن.
سێدار، بەدوای سێداردا و.. ژەهر بەدوای ژەهرداو
ئەنفال بەدوای ئەنفالداو،، گەیشتنە نەوەدەکان!

لەهاوینی 1990دا. کاتێ سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکام کرد،، بەدرێژایی ڕێگای ژوور هەورو ناو هەورو ژێر هەور، "جەلال"م هەر لەپێش چاوبوو. پەڵە هەورە سپییەکان، نیشتمانی باران، لەهات و چۆو خاوبوونەوەو لە توانەوەیاندا، سیمای ئەویان نیشان ئەدامەوە، تائەهات لەجەلال نزیکتر ئەبوومەوە، "ئیتر هەر لەجێگەی خۆمەوەو بەدەنگی بەرز ئەم پارچە شیعرەی ئەوم خوێندەوە:–

"کێ ئەیزانێ؟!
جانتایەکی خۆڵ لێ نیشووی ماندووی ڕێگای
مەڵبەندێکی دووری کەساس
ئەگاتە بەردەمی پاسگای تەمی تەکساس!
ئەتانزانی پەریی ئاوات
لەکەژاوەی دڵدارانی ئاوارەوە
نەبێ نایەت
ئەتانزانی کەشتیی شادیی
لەڕۆخی زامی دەریاوە
نەبێ نایەت
ئەتانزانی خۆر لەچرکەی
پەلەپیتکەی تفەنگەوە
نەبێ نایەت
ئەتانزانی شنەی ئاڵا لەناو ڕێژنەی
ڕاست بوونەوەی سێدارەوە
نەبێ نایەت"..

شەوبوو، لەگەڵ نیشتنەوەی بەناڵەو هاژەی فڕۆکەکەدا، بریسك و هوڕی ڕەنگاو ڕەنگی فڕۆکەخانەکەی "بالتیمۆر" ئاوی چاوانی ئەبرد.. هەناسەیەکی خۆشیی گەیشتنە مەنزڵم هەڵکێشاو لەدڵی خۆمدا وتم "کەواتە بینینەوەی جەلال خەون نەبوو، سبەینێ زوو ئەگەمە لای".. لەژووری پشکنین و کۆنترۆڵدا زۆریان گل دامەوە، وەڕس بووم، ئەو وەختەی ڕووم کردە دەرەوە، تەواو شەکەت بووبووم و فڕۆکەخانەکە چۆڵ و لەخۆم و پاسەوانەکان زیاتر کەسی لێ نەمابوو. سەعات نزیکەی چواری بەیانی بوو. وەختێ گەیشتمە دالانی چاوەڕوانی و کەس و کارم هاتن بەپیرمەوە، تەماشام کرد چەند مەترێ دوور لەوانەوە، کاك (جەلال)یش بەخۆیی و گۆچانەکەی دەستی و چەپکێ گوڵەوە وەستاوەو چاوەڕێمە..

دوای لێك دابڕینێکی وادوورو درێژی برین بەسوێی
نێوان ئازیزان
ساڵی بەیەك گەیشتەوەو دیدار
لەدایك بوونەوەیەکی ترە بەگەورەیی.
سەر لەنوێ عومرنووسینەوەیە
سەرلەنوێ گەنج بوونەوەیە
سەرلەنوێ سەوزبوونەوەو ژیانەوە،،
ئیتر هەموو ڕۆژ.. هەموو شەو
یەکترمان ئەدی و بەجووتە
ئەچووینە ناو دنیای فرمێسك و شیعرو
داستان و شاخ و یادگارەوە..
کون و کەلەبەرێکی بیرەوەریی نەئەما
سەری خۆزگەی پیا نەکەینەوە
کەماندوویش ئەبووین
بەبێ دەنگیی تەماشای یەکترمان ئەکرد..
بەخێرچی ئەی هەور، ڕەوەندەکەی ڕوانگە

ئەی دووکەڵی بەگینگڵی نامۆیی
ئەی گۆمی مەنگی شیعرو
ئەی پەڕەسێلکەی هەواری تەنیایی
ئەی شمشاڵی بێ ژنو بێ جگەرگۆشە.. بەخێرچی
تۆ دوای ئەم کۆچە کوتو پڕەت.. ئەوەندەت بەسە
کەلەدوای جەستە ماندووەکەت
چەند گوڵە هێرۆیەکی شیعرو
چەند هاوارێکی زولاڵی هەڵوێستو
چەند یادێکی سنەوبەر ئاسا جێبێڵی.
وەك پەڕەسێلکەیەك
بەهێمنی هاتیو بەهێمنی ڕۆیشتی
لەنێوان ئەو دوو هێمنیەدا..
تۆ ئاوێکی ڕوونو
تۆ شنەبایەکی وشەو
تۆ لەرینەوەی گەڵای
درەختێکی تەنیا بووی.
هاوڕێم.. جەلال!
ئێستەش دڵنیام گیانی پێت، ئەڵێ: بەختیارم
چونکە بەچاوی خۆت
کوردستانێکی بێ بەعسو ئازادت بینیو
ئینجا بۆ دواجار بەجێت هێشتین.

**هەولێر**
1993 /2 /14

**سەرنجێك: لەچلەی ئەمر جەلالی میرزا کەریم لەسلێمانی خوێندرایەوە.**



# جەلالو ڕوانگەو چەند یادێکی تر

**کاکە مەم بۆتانی**

لەساڵی (1968)ەوە، خولیای دروست بوونی یەکێتیی ئەدیبانی کوردم کەوتبووە مێشك، هانام بردە بەر هاوڕێی ئەدەبو وەزیفەو بیری کوردایەتی کاك شێرکۆ بێکەس– کەهەرچەندە حیزبی بوو، بەڵام وشكو تیژڕەو نەبوو– لەڕێی ئەویشەوە دۆستایەتیم لەتەك کاك حسێن عارف تازە کردەوە، کەزۆر نەبوو وازی لەقیادەی مەرکەزی م ش ع هێنا بوو، بەماڵەوە هاتبووە بەغدا– وەك ڕوناکبیرێکی چەپڕەوی بێلایەن ڕەفتاری دەکرد– تەقەلا دوای تەقەلامان پوچەڵ بۆوە، چونکە ئەدیبەکان: بڕوایان بەیەك نەبوو. حەسوودیان بەیەك دەبرد.

ئەترسان حکومەت بەمە ڕازی نەبێو تووشی دەردە سەریان بکا. شەڕی برا کوژیش لەئارادا بوو.. بەڵام تادەهات برادەری سێ قۆڵیمان توندتر دەبوو. لەیەکتری شارەزاتر دەبووین. لەبۆچوونە ئەدەبیو سیاسیەکانیشدا، لەیەك نزیك دەبووینەوە.. خوێندنەوەی بێژمار، دەمەتەقێی دوورو درێژ، بیرکردنەوەو وردبوونەوەی قوڵ. خواردنەوەی زۆر.. شەوچەرەمان بوو.

هەر لەو ساڵەشا، بەهۆی کاك مستەفا ڕابەرەوە، کاك جەلالی نەمرم– وەك ڕوناکبیرێکی چەپڕەوی بێلایەن– ناسی. ئەوسا لەئێستگەی کوردی کاری دەکرد، وەك بزانم، هەندێ کاروباری (رقابەی مطبوعات)تیشی ڕادەپەڕاند. لەبەرئەوەی منیش خۆم بەنەتەوەییەکی چەپڕەوی بێلایەن دەزانی– کەهەر لەسەرەتای پارتایەتیمەوە لەکەرکووك، کاك حەمید عوسمانی ڕەحمەتی، بەبیروڕای مارکسیەت ئاشنای کردم– زوو زوو لەدانیشتنەکانی شەوانو ڕاڕەوی ڕۆژنامەی هاوکاری یەکترمان دەدی، هەمەجۆرە قسەمان دەکرد، هۆگری یەك بووین. کەکاری گۆڤاری (بەیان)ی خرایە ئەستۆ، هەندێ جار لەجۆری بەرهەمو چاپ کردنیدا، ڕای وەردەگرتم– یەکەم جار بوو گۆڤارێکی کوردی بەئۆفسێت چاپ بکرێ– وەنەبێ، ئەم دیتنو هاتووچۆیە، دوو قۆڵی بووبێ، بەڵکو شێرکۆو حسێنیش دەهاتنە پاڵمان. جار جارەش: کاك کمال رؤوف. سەربەست بامەڕنی. عباس بەدری.. بەشداریان دەکردین.

جەلالی نەمر، زۆر حەساس بوو. کەم دوو بوو. کەم جار شیعری خۆی دەخوێندەوە. بیزانیایا گوێی لێ ناگرن، دەی بڕیو دووبارەی نەدەکردەوە.. ئەدیبە نوێ خوازو لاوەکان، نەك هەر بەرهەمەکانیان پێخۆش بوو، بەڵکو، تامو چێژی تازە بوونەوەشیان لێ وەردەگرت. جەلال زۆر بڕوای بەخۆی بوو. لەسەر نەخشەی تایبەتی خۆی دەڕۆیشت.. ئەو ماوەی پێکەوە بوون، جارێ نەم دی، بەرهەمی بەسەر ڕۆژنامەکانا بسەپێنێ. داوای شیعریان لێ نەکردایا، نەی دەنارد.. لەژیانی ڕۆژانەشیا؛ بەمۆنیو گرژی نەم دی. هێمن، لەسەرخۆ، دەم پاك، دەست پاك.. قەد باسی خەڵکی تادوژمنیشی نەدەکرد. هەمیشە خولیای شیعر بوو. بەڵام بەرهەمی کەم بوو بەشێوەو ناوەڕۆکێکی سەرکەوتووانەوە شیعری دەنووسی.

جەلال، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نووسەرانی کورد نەبوو، بەڵام پرسو ڕای پێدەکرا.ئەویش تەخسیری نەدەکرد. کە لەسەرەتای شوباتی 1970دا نووسەران دامەزرا، لەڕێکخستنو دامەزراندنی بارەگاکەیدا یارمەتی حسێنو منی دەدا.. ماوەیەکی زۆر بوو ڕوناکبیرانی کورد پاش داخستنی یانەی سەرکەوتن شوێنێکی وایان نەبوو بەئازادی تیا کۆببنەوە کەبارەگاکە ئامادە کرا جموجۆڵێکی زۆری تێکەوت. شوقەکە کەوتبووە شەقامی (الرشید)و بەرامبەر گۆڕەپانی (الغريری)، بووە شوێنی کۆبوونەوەی ئەدیبو نووسەرو ڕۆژنامە نووسە کوردەکان. باسی دنیای: ئەدەبو ڕوناکبیریو سیاسەتی بێ پەروا دەکرا. میوانەکانی شارەکانی کوردستانیش، هەرلێرە دۆستو هاوڕێیەکانیان دەدۆزیەوە.. کەتاریك دادەهات، پەرشو بڵاوەی لێ دەکرا، لاوو نوێ خوازەکانیش، شەقامی (ئەبوو نەواس)یان دەگرتە بەر، بەدەم ڕێگاوە، لەگازینۆو باڕەکانا، هەرباس دنیای ئەدەب بوو. جاروباریش دکتۆرەکان: عزالدین مستەفا. مارف خزندار. کاوس قەفتان. احسان فؤاد ماموستایان: محمد بەدری، صلاح شوان. انور شاکەلی. عبدالله عباس. محمود زامدار.. لەم دانیشتنانانە ئامادە دەبوون.. میوانەکانی شارەکانی کوردستانیش: لطیف حامدی نەمر. عبدالله پەشێو. ممتاز حیدری. مصطفی صالح کریم. شێرکۆ بێکەس– کەئەوسا لەسلێمانی بوو– کەدانیشتنەکانمان گواستەوە (یانەی العدلیة) مامۆستایان: محیالدین زەنگنە. یوسف حیدری. یاسین نصیر. فاضل العزاوی. عبدالستار ناصر.. دەستەی نووسەرانی شیعری 69.. هەندێ جار لەگەڵمانا دادەنیشتنو بەشداری قسەمان دەبوون.

لەم ماوەیەدا، بزوتنەوەیەکی ڕوناکبیری بەرفرەوان لەعێراقدا سەری هەڵدابوو. ڕوناکبیرە لاوەکانی کورد، جگە لەئەدەبی کوردی، بەبەرهەمە ئەدەبیە تازەکانی عەرەبو (البيان الشعری) ئەدونیسو هاوڕێکانی لەڕێی وەرگێڕانیشەوە بەدنیای پانو بەرینی ئەدەبی ڕۆژئاوا.. ئاشنا بوون.. بەچرای نوێ خوازیەوە، بەناو بەرهەمی ئەدەبی کوردی گوزەریان دەکرد. بەتایبەتی جەلالی نەمر، لەهەر شوێنێ شتێکی نوێ خوازی وەدەست بکەوتایا، دەیخوێندەوەو بۆ ئێمەشی دەهێنا. هەروەها ئێمەش بۆمان دەبرد.. ئەمانە، ڕێخۆشکەر بوون، بۆ ئەدیبە لاوە نوێ خوازەکان.. ئەدیبە کوردەکان– کەلەسەر کورسی ئەدەبیمان دانیشتبوون– نەئامادە بوون گوێیان بۆ ڕاگرن، نەڕێیان دەدان لەنزیکیانەوە، کورسی نوێ خوازیان دابنێن، بەهەموو شێوەیەك بەرهەڵستیان دەکردن. هەرچەندە، نەیان دەتوانی لەگەڵ ئێمەدا شتێك بکەن. بەڵام ئەدیبە لاوەکان بە دەردێ چووبوون، لە پۆستەی خوێندەوارانیش چەند دێڕێکیان بۆ بڵاونەدەکرایەوە. دیسان، ئەمانە، هەمووی، لە دڵ و دەروونی هەر چوارمان، پەنگی خواردبۆوە هەریەکە لەلای خۆشیەوە، بیروڕاو هەستی.. گەڵاڵەکردبوو.

ڕێکەوتن نامەی ئاداری 1970، نەك هەر لە ئاستی سیاسەتدا شتێکی نوێی هێنایەکایەوە، بەڵکو گۆمی ئەدەبی کوردی و بیری کوردی و ڕووناکبیری کوردی.. شڵەقاند. گۆڤارو ڕۆژنامەی ئازاد دەرچوو. کۆڕو دانیشتنی بێ ترس دەکرا. ئەوسا، جەلالی خوالێخۆشبوو کاك حسین عارف و من لە بەغدا بووین. خولیای ڕاپەڕین لە مێشکمانا دەخوولایەوە. کاك شێرکۆ و جەمال شارباژێریش لە سلێمانی گینگڵیان دەدا.. چەندەها ئەدیبی تریش.. هەمووومان گەیشتینە ئەوەی دەبێ شتێك بکەین. لە هەمووومان گەرمتر، کاك شێرکۆ و جەلالی نەمر بوون کاك حسین، وەك بیرکەرەوەمان وابوو. کۆمەڵە پرسیارێك بەردەممانی گرتبوو: مەبەست لە نوێ خوازی لاسایی قوتابخانەکانی پێش خۆمانە؟! کە وانییە، نوێ خوازی لە ئەدەبی کوردیدا چ دەگەێنێ تازە کردنەوەی شێوەی ئەدەبی، ڕستە، وشە.. لە کوێوەیە؟.. ناوەڕۆکی نوێ چ دەگەێنێ. میراتی ئەدەبیمان چ کەموکورپەکی هەیە؟. ئینجا: مەولەوی، نالی، گۆران.. ئەدەبی کلاسیکی.. واقعیە، واقعی ئیشتراکی.. چەندەها پرسیاری تر.. یەکە یەکە، وەڵاممان دەدایەوە. هەڵەمان لە وەڵامەکانی خۆشمان دەگرت. کە شێرکۆ دەهاتە بەغدا، دانیشتنەکانمان پڕتر و چڕتر دەبوو. تا بە شێوەیەکی ڕەسمی یەکەم دانیشتنمان لە بارەگای نووسەران گرت. ئادار تێنەپەڕی بوو کە زووربەی پرسیارەکانمان وەڵام



دابۆوە. ئەو شتانەمان دەست نیشان کرد کە لێی دەدوێین و چۆنی باس دەکەین.. دارشتنی بانگەوازەکەمان بەکاك شێرکۆ سپارد. کە دەستەی دامەزرێنەری نووسەران هەڵوەشێندرایەوە —کەمن سکرتێری بووم— ناچار دانیشتنەکانمان بردە ماڵان.. لە دوا کۆبوونەوەدا. پاش لێدوانێکی خەست، بەڕەزامەندی هەرچوارمان مۆرکرا. کاك شێرکۆش لە جیاتی جەمال شارباژێڕی مۆری کرد. کە بانگەوازەکە برایە ڕۆژنامە (هاوکاری).. کاك کمال ڕەووف خوێندیەوە داوای کرد ئەویش مۆری بکا— ئەوەی ڕاست بێ، حەزمان نەدەکرد کەس بەسەرپێیی لەگەڵمانا مۆربکا. چونکە جگە لەوەی دێتە سەر حازری، چاوەڕوانی ئەوەشمان دەکرد کە ئەدیبەکان لێمان ڕاپەڕن، تۆمەتمان بدەنە پاڵ —کاك جەلال تکای لێکرد بە سەرپێی تەماشای نەکا و بەوردی بیخوێنێتەوە بەڵام هەروازی نەهێنا. وتی: من مۆری نەکەم، بۆتان بڵاوناکەمەوە. بە ناچاری ڕازی بووین و مۆری کرد و بڵاوکرایەوە.

ئەوەی سەرنجی ڕەخنەگرو ڕووناکبیران ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە هیچ بەیاننامەیەکی سیاسیش ئەوندە خێرا، دەنگی نەداوەتەوە. هەر لە هەفتەی یەکەما. بوومە لەرزەیەکی وای بەرپاکرد، دنیای بیری کوردی شڵەقاند (هەر زوو کاك کەمال خۆی لەبەر بردە دەرو پاشگەزبوونەوەی لە هاوکاریا بڵاوکردەوە). ڕوانگە ڕووناکبیرانی کوردی خستە سەرتای تەرازوو، یان لەگەڵی یان دژی.. لەسەرێکەوە ئەوپەڕی ڕاستڕەوو چەپڕەوی بیری کوردی یەکیان گرت و کەوتنە پاشقول لێ گرتنی و تۆمەت و شکات کردن بۆ لای سیاسەتمەدارانی ئەوسای کوردستان، تا بە شێوەیەکی شێواو هەڵگەڕاوەیی گەیاندیانە گەورەترین دەسەڵاتداری کوردستان، بەڵام ئەوەی دڵی ئێمەی خۆش دەکرد، لاوان و بەرەی نوێی ئەدەبەکەمان بوون. کە گەرمترین پشگیرییان کردین، داوایان دەکرد ببنە (ڕوانگەیی). ئەمەش پتر پاڵی پێوەناین کە شانی بدەینە بەرو ڕووبەڕووی ناحەزانی ئەدەبی نوێی کوردی بووەستین.

ئێمە دەمان ویست، ئەوەی لە بانگەوازەکەدا وتومانە، بە بەرهەم بیخەینە بەرچاوی ئەدەب دۆستان، بۆ ئەوە، هەندێ وێنەمان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بڵاوکردەوە، بەڵام جەلالی نەمر حەزی دەکرد، ئەو جۆرە بەرهەمانە بە کۆمەڵ بخرێتە بەردەمی خوێندەوار، ئەوەش پێویستی بە گۆڤارێکی تایبەتی هەبوو. پاش لێکۆڵینەوەو مسۆگەرکردنی پارەی چاپ. بڕیارماندا بە ناوی گۆڤاری (ڕوانگە) دەری بکەین. بە مەرجێ؛ تازەترین بەرهەمی نووسەرانی تێدابێ و نوێ خوازی پێوە دیاربێ. بەرهەمی هەموو ئەدیبە لاوو نوێ خوازەکان وەربگیرێ. بۆ ئەوەی بۆ (4–5) کەس تەرخان نەکرێ. کەمترین پارەشی تێ بچێ. بۆیە بڕیارماندا وەك نەمر محمد توفیق وردی بکەین و لە نەجەف بە چاپی بگەێنین.

پێش ئەیلوول، منیش چومە سلێمانی، تەنیا کاك حسین و ڕەحمەتی لە بەغدا مانەوە، بەڵام دەیەها ئەدیبی نوێ خواز دەورەیان دابوون. تا دەهات دەنگی ڕوانگە پتر پەرەی دەسەند. لە هەموو جموجۆڵی ئەدەبی کوردستان و بەغدا، باسی ڕوانگەی تێ دەکەوت.. کەم ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامە ئەدەبییەکان هەبوون. نووسینی دژیان لەگەڵ ڕوانگەی تێدا نەبێ.. پاش ئەوەی بەرهەمەکانی ژمارەی یەکی گۆڤار ئامادەکرا. هەردووکیان چوونە نەجەف و لەگەڵ چاپخانە ڕێکەوتن. زوربەی هاتوو چۆو کارەکانی چاپیش کەوتە ئەستۆی جەلالی نەمر، چونکە جگە لەوەی ماڵو منداڵی بە ملەوە نەبوو. کارەکەش وابوو دەیتوانی بچێتە دەرەوە. ئەوەی کاك جەلالی دەناسی، دەزانێ کە هیچ کاتێ گوێی نەداوەتە ماندووبوون. زۆر جاریش لەسەر باخەڵی خۆی هات و چۆی نەجەفی دەکرد. دوو ژمارەی لەوێ درەچوو، پارەکەی گەلێ کەمتر بوو لە چاو بەغدا.. بەمجۆرە سەرتای نوێخوازی لە کوردستاندا پەرەی سەند.. وەك لە ساڵ ڕۆژی —عبدالخالق معروفی شەهیدا داوام کرد. دیسان لێرەشا دووبارەی ئەکەمەوە دەڵێم ئیمڕۆ، کاتی ئەوە هاتووە کە پڕ بەدەم بانگەوازی ڕوانگە (ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن) بۆ پاکسازی دنیای ئەدەب و ڕووناکبیری و ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنی نەتەوایەتیمان دووبارە بکەینەوە. هەزار سەڵاو لە گیانی پاکی شەهیدانی ڕێی قەڵەمی پاکی کوردو دوا قافڵەیان جەلالی نەمر. هەر بژین.

سەرنج:

لە چلەی نەمر جەلال میرزا کەریم دا خوێندرایەوە لە سلێمانی.

هەولێر 1993/2/15

# جەلالی میرزا کەریم

## یاخی بوونی مرۆڤی کوردی هاوچەرخ

**سەربەست بامەڕنی**

مرۆڤی کوردی یاخیبوو.. مرۆڤی کوردی هاوچەرخ.. دوا ئەڵقەی بەندێنی بشکێنێ.. جەلال کەریم.. نوێ خوازو گۆڕان، لەچاو پێکەوتنێکا لەگەڵ هاوکاری باسی یاخی بوونو ئەدەبو جەنگی درێژخایەنو دروست بوونی ئینسانی نوێ ئەکاتو پەردە لەڕوی واقیع هەڵ ئەماڵێ زۆر کەمن ئەوانەی جەلال کەریم نەناسن وەکو شاعیرێکی هەڵکەوتوو خاوەن تاقیکردنەوەیێکی دوورورێژە.. بەڵام کەم کەس لەجەوهەری موناعاتی جەلال کەریم گەیشتوون.. ئەم چەند گفتوگۆیەی ئەخەینە بەرچاو خوێنەرانی بەڕێز، هەنگاوێکە بۆ لێکۆڵینەوە لەو موناعاتو تاقە کردنەوەیەی کەسەرچاوەی تاڤگەی ووشە جەنگاوەرەکان..

ووشە نوێ خوازەکان.. ووشە ڕاستو نەترسەکانی جەلالی میرزا کەریمن کەبووەتە وێردی سەر زوبانی هەموو جەنگاوەرێکی نوێ خواز..

"هاوکاری"

—کاك جەلال.. لەکوێوە دەست پێبکەین؟

—لەسەرەتای کۆتایییەوە!

—کۆتایی چی؟

—کۆتایی سەردەمێکی پڕ لەژانی هەست پێنەکراو لەلای خۆم..

—کەژان.. هەست پێ نەکراوبێ.. چۆن ئەزانی ژانە؟

کەووتم سەرەتا نیازم لەهەست پێکردنێکی تازەی ئەو ژانە کۆنەیە کەلای من کۆتایی هاتووە.

—بەرەو چی؟

جاران هەر هەستم بە ژان ئەکردو بەس بەڵام ئێستا لەگەڵ هەست پێکردنما بە ڕوویا ئەتەقێمەوەو ڕائەچەنم و وەك هەر مرۆڤێك کە ئەم ڕاچەنینەی لا مەبەست بێ لەگەڵ کاروانی هەموو ڕاپەڕیوێکی ڕاست گۆو لە ترسدا بەرەو جەنگێکی سوتێنەری ئەوتۆ مل ئەنێم کە مانای ڕاستی مرۆڤایەتی تیادا بچەسپێ.

—باسی بەڕویا تەقینەوەت کرد.. ئایا هەموو تەقینەوەیەك بەڕاست ئەزانی.. ئەو تەقینەوەی کە تۆ مەبەستتە چییە؟

بێگومان هەموو تەقینەوەیەك نا.. هەموو تەقینەوەیێك دەنگە.. دەنگیش هەر تەنیا دەنگ هەموو شتێك نییە دەنگی تەقینەوەی ڕاستەقینانە لای من تەنیا ئەو دەنگانەیە کە دەربڕینێکی ڕاستەقینەن بۆ گۆڕانی هێشتا ڕێك نەخراوی.. نە نووسراوی ئەو چینە زەحمەتکێشەیە کە ئاوازی هەرگیز نەمردوی مرۆڤایەتی لەسەر زاریانا مژدەی بەختیاری ڕائەگەیێنێ.

—کەواتە ئەو تەقینەوەی تۆ مەبەستتە، لە ناخی کۆمەڵی ڕەنجدەرەوە هەڵ ئەهێنجرێ.. تەقینەوەیێکی ئاڕاستەکراوە.. ئەمە لەگەڵ تەقینەوەی (ڕوانگە) کە هەر تەقینەوەیەو بەس ناگونجێ.. ئەمە بەچی لێك ئەدەیتەوە؟

ئەوەی ئەیڵێیت لای من وەڵامەکەی دوو بەشە.. کە هەردووکی پەیووەندی ڕاستەوخۆی پێمەوە هەیەو ناتوانم لێی ڕاکەم..

یەکەم:

ئەو تەقینەوەی خەڵکی و من مەبەستم بێ، بێ چەند و چۆن ئاڕاستەکراوەو لە مەودای کاری گۆڕانی کۆمەلایەتیدا و لە بەجێ هێنانی ئەرکەکانی سەرشانیا ئەبێ هەر لە ناخی کۆمەڵانی ڕەنجدەرەوە سەر هەڵبات و بتەقێتەوەو دووا ئەنجامیش ئەبێ هەر بۆ سوودی ئەوان بێ.

دووەم:

(ڕوانگە) لە مەودای ئەدەبی ئێستای کوردیا لای من تەقینەوە نییەو بەس، بەڵکو بەپێی ئەو بیروباوەڕەی کە ناتوانم لێی دەس بەرداربم ئەبێ (ڕوانگە)ش شانبەشانی تەقینەوەکەی لەگەڵ کاروانی ڕاپەڕیووی ڕنجدەراندا بڕوات وە بەشێکی هەرە گەورە بگرێت لە ڕابەریکردنی ئەو کاروانەدا.

—کەواتە بەلای تۆوە ئەبێ ئەدەب لە خزمەتی بزووتنەوەی ڕەنجدەرانا بێ.. وایە؟.

حەز ئەکەی جارێکیتر دووبارەی بکەمەوە..

—چاکە.. تۆ باسی ڕابەریت کرد.. مەبەستت ئەوەیە ئەدەب دەوری ڕابەری ئەبینێ؟

تەنیا ئەدەب نە.. بەڵکو وەك ووتم ئەبێ ئەدەب بەشێکی گرنگ لەو ڕابەری کردنەدا بگرێت.

—بەڕای تۆ.. جەنگە سوتێنەرەکە.. وە یاخود ئەدەب.. کامیان بنچینەن و. کامیان ئینسانی نوێ دروست ئەکەن؟

بنچینەی هەرە گرنگ پێویستیەکانی گۆڕانی کۆمەڵە، هەر لە پێویستییەوە سوپای کارگێڕی ئەوتۆ ئەخوڵقێت کە بۆی هەیە بە پێی باری سیاسی ئەو کۆمەڵە ببزوێو ئاگری جەنگێکی پیرۆزی ئەوتۆ خۆشکات کە سیماو ڕەنگ و دەنگە قەبەو ناشرینەکانی کۆمەڵی پێشوو ڕیشەکێش بکات.. ئەدەبیش، ئەبێ جەنگاوەرێکی لەخۆبوردە بێ، شەرەفی بەشداربوونی ئەو گۆڕانەی بەلاوە ئەوپەڕی شانازی بێ.. بەمەرجێ نەك وەك تەنیا سەربازێکی ئەو جەنگە بەڵکو وەکو ڕابەڕێك و ئەدیبێکیش.. بەم پێیە هەردوو لا قال کەرو دروستکەری ئینسانێکی نوێن.. کە ئەمەش کارێکی گرنگی درێژخایەنە..

—لەم دووایانەدا.. ئافرەت وەك وێنەیێك لە بەرهەمەکانی تۆدا نەبووە.. بۆ؟

نازانم!!

—ئایا وەزعی ئافرەت، وەك گیروگرفتێکی کۆمەلایەتی هەستی پێناکەی.. یا بایەخی نادەیێ؟!

مەسەلەی بایەخ پێدان، کۆتایی پێهاتووە، چونکە گیروگرفتی ئافرەت بەشێکە لە گیروگرفتەکانی کۆمەڵ.. هەست پێنەکردنیش بەلای منەوە تەنیا لەوێوە هاتووە کە من لەو شیعرانەدا بەگشتی بۆ ئەوە چووم ڕووبەڕووی واقیعەکە ببمەوە..

—یاخود تاقی کردنەوەیێکی تاڵت هەبووە لەگەڵ ئافرەتدا. هەوڵ ئەدەی لەبیری خۆتی بەریتەوە!!؟

وەنەبێ شیعری لەو بابەتانەم نەبێ.

—لەکاتێکا بووە کە تاقی کردنەوەکە ئەنجامی نەدابوو بەدەستەوە!

هێشتا هەر لەگەڵ ئەو تاقیکردنەوەیەدام.. ئەگەرچی تاڵیشە..

دووا موعانتت چیبووە؟

ئێستامە!!

لەگەڵ چییا؟

لەگەڵ ئەو خوا هەزارو یەك ناوەی درۆ، هەڵپەرستی، دوفاق نیزمی خۆپەرستی، دوو ڕوویی.. لە باوەشیا کۆش کراون.

—وەك ئەوەی لە دووا شیعرەکانتا باست کردوە؟

بەڵێ!!

-بەو پێیە کە ئەدیبی.. ڕات بەرامبەر یەکێتی نووسەرانی کورد چییە؟

دروست بوونی یەکێتی نووسەرانی کورد، نوخشەو نۆبەرەییێکی دڵخۆشکەرانەبوو... بەڵام ئەفلیج.. بەوەی ئەبوایە لە تەمەنی یەک ساڵانەی‌دا دابیتوانیایە پێ بگرێ‌و ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆیەتی بەجێی بێنێ.. وامان لە یەکێتی ئەویست کە دەوری هەرە گەورەی بوژانەوەو پێشخستنی بزوتنەوەی ئەدەبی ئەم سەردەمەی نەتەوەکەمانی بخستایەتە ئەستۆ.

-وەك شاعیرێك... ڕوو تێکردنە مەیدانی شیعر نووسین بەچی لێك ئەدەیتەوە؟

ئەو ڕووتێکردنە سەرئەنجامی تاقیکردنەوەو تەمەنێکی درێژی بزووتنەوەی ئەدەب یا شیعر نووسین نادا بە دەستەوە... وەك هەر گڕوکفو هەڵچونێك کە زوو ئەنیشێتەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی باشی ئەو ڕووتێکردنەی ئێستای لاوانمان بۆ شیعر ووتن سیماو شێوازێکی جیاواز تری پێوە دیارە کە دوور نییە بمێنێتەوەو جێی خۆی بگرێ.. ئەگەر خۆی دوورە پەرێز نەگرێت لە خۆ پەروەردە کردن و تواندنەوە لەگەڵ پێویستیەکانی ئەم سەردەمەی کۆمەڵەکەماندا.

-بەلای تۆوە شیعر ئیلهامە یاخود پراکتیك و دەوڵەمەندییە لە زماندا..؟!

ئیلهامە.. بەڵام بەهرەی داڕشتن و بەکارهێنانی چاکی کەرەستەی ئەوێ...

-مەسەلەی کە ئیلهامە... ئەوە وەها ناگەیێنێ باوەڕت بە میسالیەت هەیە!؟

ئیلهام.. بەلای مرۆڤی ئەم سەردەمەوە دوورە لەو میسالیاتەوە کە تەنیا خەیاڵێك یا هۆییێکی هاندەری میتافیزیقیانە.. ئەو شیعرەی پێ هەڵڕێژێت.. بەڵکو گێژاوی ئەو موعاناتەی ئەو شاعیرە تیای ئەژێ و زیاتر لە خەڵکی تر ئەبێتە هەورێك لە سینگیا.. تەنیا ئیلهامە کە بارانی ووشەی پێ هەڵڕێژێت.

زۆر شتی ترمان ماوە لەگەڵ کاك جەلال لە سەریان بدوێین، هیواداریین لە دەرفەتێکی تردا، ئەوە بکەین و هیواداریین خوێنەرە بەڕێزەکان لەو لێکۆڵینەوەو لێدوانە بەشداربن.

***لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاوکرلوەتەوە**

# بۆ مامۆستاو هاوڕێم

# جەلالی میرزا کەریم

**قوبادی جەلی زادە**

بیستو یەك ساڵ پێش ئەوڕۆ لەهۆڵێکی کەرکوکی نیمچە ئازادی ئەوساو تەواو داگیر کراوی ئەمڕۆدا، شاعیرێکی نوێ خواز، قەڵەمێکی شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر دەنگی دلێرانەی خۆی لێ هەڵبڕی‌و گوتی:

ئەی کوردستانی پێشمەرگە

ڕاستە دڵی چیاکانت

چاوی گەشی مناڵانت

ئەمساڵ پڕ شایی‌و ئاهەنگە

بەڵام قسە هێشتا ڕەنگە

خواستو مەرام یاقوتێکی شەوچراغی

ناو گەرووی تاری نەهەنگە.

لەو دەمەوەو پێش ئەو دەمەش مامۆستا جەلالی میرزا کەریم مان دەناسی دەمانزانی یەکێك بوو لەو پێنج درەختەی، گوڵی بیری نوێیان دەردەکرد. میوەی کرداری نوێیان پێدا شۆڕدەبووەوە، چۆلەکەی ووشەی نوێیان بەسەر لق‌و پۆپەوە هەڵدەنیشتەوە.

دەمانزانی جەلالی میرزا کەریم یەکێك بوو لەو پێنج مۆمەی هەر زوو دەرکی بەوە کرد کەزمانی شیعر خەریکە لەگۆ دەکەوێ‌و شەختەیەکی ڕەشیش وا ووردە ووردە چاوە کاڵەکانی فریشتەی شیعر داگیر دەکات..

دەمانزانی جەلالی میرزا کەریم یەکێك بوو لەو پێنج چاوە بەزەیی‌یانەی بەدەوری تەرمی شیعری گۆرانەوە ئەڵقەیان بەستو دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی جگەر سۆزانەی خۆیان بۆ هەڵڕشت. لەنێو منداڵدانی قەڵەمدا، ئەو تنۆکە



ڕۆندکانە بوون بەمژدەی لەدایك بوونی ئەشق‌و هەوای ووشەیەکی تر، زمانێکی تر، شیعرێکی تر.

کەکێوە سەرسەختەکانی نیشتمانیش زریکەیان لێ هەڵستا کاك جەلال یەکێك بوو لەو پێشمەرگە قەڵەمانەی بەپیر هاواری چیاوە قەڵەمی کردەشان‌و پشتی کردە شارو باوەشی بەشاخدا کرد، ئەو دەمانەی پێشمەرگە بەرەو سەنگەری داکۆکی‌و مەتەرێزی شەرەف ڕێچکەیان دەبەست؛

پێش ئەوەی چاوی تفەنگەکانیان بەباروود برێژن.

پێش ئەوەی دەست بۆ کولێرەیەکی گەرمی میوان خانەکانی شۆڕش درێژکەن.

لەمەزاری بەردەمی خێوەتگای ئێوەدا، بەرپشتیان بەچەپکە نێرگزی ووشەو ڕەشەرەیحانەی شیعر دەڕازاندەوە.

لەنێو سەنگەریشدا، پێش ئەوەی پێشمەرگە سێرە دابگرن، پێش ئەوەی پەنجە لەسەر پەلاپیتکە توند کەن‌و هەناسە ڕابگرن، پێش ئەوەی تفەنگ بدەنە قاقای پێکەنین، شیعری تۆ لەگەرووی جەنگاوەردا چەخماخەی داستانی هەڵمەت بوو.

ئەو وەختەش نسکۆ سەنگەرەکانی کوێر کردەوە، چەلەنگ‌و مێرخاسەکانی چیای چەك کرد، تۆ لەدەرکی چادرەکەت دا چەند ساتێ پێت لەعەردی چەقاندو بێ ئومێد داتە پرمەی گریانێکی بەکوڵ‌و دوا چەپکە قەسیدەی بریندارت چنی‌و خستە بەرپشتێدی خۆتەوە، لەدۆزەخێکەوە پەڕیتەوە دۆزەخێکی تر، دیارە دەتزانی دەروازەی هەموو دۆزەخەکان بۆ مرۆڤی بێ گوناهی کورد لەسەر گازەرەی پشتن‌و بەهەشتەکانیش هەر خەون‌و هەرخەون هەر بەخەونیش دەمێننەوە.

پێت وابوو تاڵاوی تاراوگان لەشەکراوی ژیانی ژێر چەپۆکان شیرین ترە.

پێت وابوو شەوەزەنگی ژێر زەمینەکانی غوربەت لەخۆرەتاوی کوردستانێکی بێ پێشمەرگەو تفەنگ ڕۆشنترە.

هەر لەدوورەوە دەمناسی.. زانیمان لـەوێش، لەمەنفاشـدا چـەرخی چـەپ گەرد گورزێکی کوشندەی لێ وەشاندی، گورزێك گیانی شەکەتی بێ هاوڕێو بێ هاودەمو بێ هاوسەری بۆ لێواری مردن ڕاکێشای، بەڵام کوردستان، بەڵام سلێمانی، بەڵام شیعرە، شێلگرانە دەخلیت بوون، نا..

توخوا.. نا.. تۆش مەبە بەنالی.. تۆش مەبە بەحاجی. چاوە پڕ لەحـەزو هیواکانت هەڵێنـەوە. هـەر دیتت گـەر نـەبی‌یان بـەر نـەفرەتی مێـژوو کـەوتن‌و حەبیبان بەتارای سووری بووکێنی‌یەوە بەپیرتەوە هاتن.

دەزانم گـەر شیعر نەبوایـە ئێسـتاکە تـۆ لـەوێ سـەربازێکی وون بـووی، گۆڕێکی بێ تاجە گوڵینە، چلەیەکی بێ فرمێسك.

شیعر ئەو فریشتە دەست‌و پەنجە سپی‌و پیرۆزە بوو یەکە یەکە برپرە لێك دابڕاوەکـانتی لێـك گـرێ دایـەوەو مۆمێکـی دیکـەی بەتاریکسـتانی تەمـەنت بەخشی.

مامۆستام کاك جەلال..

تۆ گیانێکی دوو لەت بووی

تۆ لێرە گرێکی سووری بافلی ئاگر بووی تۆ لەوێ، مۆمێکی داسیاوی

بەیازی مام نالی‌و شکۆفەی بەبەختی خەواڵووی مام حاجی قادر بووی.

تۆ لێرە، سروودی شۆڕش بووی لەگەرووی تفەنگ‌و پێشمەرگەی

نەسرەوتن.

تۆ لەوێ، تاڵێکی دەنگی خۆت کردبووە ژێ‌یەکی گیتاری پۆڵ ڕۆپسن

ئاوازی کوردانەت دەژەنی

بۆ تیشکی هەتاوی سەرکەوتن.

تۆ دوو دەستی لێك دوور بوویت.

پێنج پەنجەی ئەو دەستەی ئێرانەت،

پێنج دانە فیشەك بوون

بەردەوام مەخزەنی بەر پشتی پێشمەرگەت پڕ دەکرد.

پێنج پەنجەی ئەو دەستەی ئەوێشت،

پێنج تابلۆی پیشانگای دووکەڵ‌و ژەهر بوون

خاك بەخاك شار بەشار دەتگێڕان

تاواقی ئاسمان‌و مرۆڤت وڕ دەکرد.

تۆ.. لەدار بەڕوێك دەچووی پـەل‌و پـۆی پـەرتی ئاسمانی مەنفاو ڕەگیشی بەتابەردی نیشتمانی زێدەوە روو چووبێت.

ئەمجارەیان کوردستانی ڕاپەڕین‌و کۆچ. کوردستانی ڕزگاری‌و سەرکەوتن مۆمێکـی گرشـەداری دیکـەی لەهـەناوت دا هـەڵکردو رووت کـردە دڵـە ماندووەکەت‌و گوتت:

دەزانم کەمەلا نالی لەسەفەر نەهاتەوە

قەندیل مەندیلی ئەبەدی بۆ لەسەرنا..

کەحاجی قادر کەشیدەی بەکێلی دوو گۆڕەوە بەخشی

هەیبەسوڵتان پشتێنی نێرگزی بۆ بەست

بەڵام.. نا.. من دەگەڕێمەوە..

نیاگارا.. ئەگەر چیدی گژو گیای هۆنراوەکانم

بدەمە بەر وردە تیشکی شەپۆلە زیوینەکانت

عەلی بەگم لێ زیز دەبێ.

مسی سی سپی..

ئەگەر چیدی وورده ماسی ڕەنگاو ڕەنگی ووشەکانم

لەنێو چاوە شینەکانت بەرەڵاکەم،

دڵی سیروانم لێ دەشکێ

من دەشچمەوە..

سەیوان دەڵێ: نەیەیتەوە ئیدی شەرت بێ

گۆڕی دڵم بۆ هیچ شەهیدو شاعیرێ نەکەمەوە.

ئەوەل سەحەر بوو، نۆشدارەکان نووسـتبون، دەرگـای مـەنفاو غوربـەت‌و خەستەخانەت خستە سەر پشت، باڵە بەستراوەکانت کردەوە، وەك هەڵۆیـەکی سەرسپی لەشەققەی باڵت داو ڕوەو کوردستان هەڵفڕیت.

کوردستانی نیشتمان

کوردستانی کەوتن‌و سەرکەوتن

کوردستانی نسکۆو هەڵستانەوە،

کوردستانی شەهید بوون‌و لەدایك بوون.

دەتزانی باڵە هەڵکرووزاوەکانت زەحمەت بەرگەی تەی کردنی ئەم ئاسمانە بێ تخوویە بگرن. دەتزانی دڵە زامدارەکەت سەفەرەی نیشتمانێکی بێ نان‌و بێ ئاگرو بێ دەرمان نی‌یە، بەڵام تۆ بەدکتۆرەکانت گوت: من دەگەڕێمەوە بناری گۆیژە، هەموو چیا بەڕن بڵندەکانی دنیا لەئاست باڵای گۆیژە کورتە بنەن.

من دەچمەوە سلێمانی، ڕەشـەبا شـتێەکەی سـلێمانی بەسـروەی بـەنازوو نووزی هەموو بەهەشتەکانی گۆی زەوی‌و ئەو دیو گۆی زەوی ناگۆڕمەوە.

تانزیك تر دەبوویتەوە شاباڵی تازەو تازەترت لێ دەڕسکا بڕینـەکانت کزو کزتر دەبوون.

لێـم دیـار بـووی لەسـەر قوللەیەکـەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری نیشـتیتەوە. بەپیرتەوە هاتم، لەدەریایەك دەچووی لەیەکەم ڕوانینا پیاو نەزانێ وەستاویا بەڕێوەیە.

دەریایـەك پڕاوپڕ لـەڕەوەزە مەرجان‌و گەوهـەر. تەماشای گۆڤانەکەم کـرد، وام دەزانی لکەدار گوێزێکی قەسیدەیەکی مەحوی‌یـەو دیـلان بـەدیاری بـۆی هێناوی.

باوەشم پیا کر دی.. شێخ وەسانێکی تربووی

بەشێك لەدرەختەکانی گیانت ووشك هەڵگەڕا بوون.

ڕەوە کانیلەیەکی تەمەنت چکیان کردبوو.

پۆلە کۆترێکی سپی سەر گومبەزی دڵە سەوزەکەت شەهید بوو بوون.

حەزم کرد گوێ لەترپەی پێ‌یەکانت بگرم.

ترپەی پێت ترپەی ئیقاعی سەردەم بوو

حەزم کرد دەستەکانت بگوشم.

پەنجەی تۆ لەو پەنجە زێڕینانە بوون

پرچی بەیان‌و کاکۆڵی هاوکاری یان شانە دەکرد

حەزم کرد بچمە ناوی قوڵایی چاوەکانتەوە،

چاوی تۆ لەو چاوەگەش‌و تیژانە بوون..

ئەودیو دیوارە ئەستوورو بڵندەکانیان دەبینـی حـەزم کـرد گوێـم لـەدەنگت بێ، دەنگی تۆ لەو دەنگە یاخی‌و دلێرانە بوون، پێ‌یان گوتین:

ئەو شتانەی بەگەردنی فریشتەی شیعرەوە شۆڕبوونەتەوە پەتن، ملوانکە نین.. بیان پسێنن.

ئەو شتە بریقەدارانەی بەقۆڵ‌و باسکی ڤینۆسی ووشەوە زڕەیان دێ، بازن نین، کەلەپچەن، تێکیان بشکێنن.

لەو ڕۆژەوە بووی بەهاوڕێم.. لەنزیکەوە ناسیمی. لەپاکی پاکتربووی،

لەدڵسۆزی دڵسۆزتر بووی، لەهێمنی هێمن تربووی تۆ لەنێوان ژیان‌و مردن دا

دوا بڵێسەی مەشخەڵانێکی بەرتۆف‌و شەستە باران بووی.

تۆ لەنێوان گۆچان‌و قەڵەمدا

شیعرێکی بێ حەسانەوەو بێ هەوادان بووی.

سەد مخابن من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم

کەهەولێر "کامەران"ێکی تری

بەرێی کرد بۆ سلێمانی

32

سەد مخابن من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم
کەبروسکەی ماڵئاوایت، لەمنارەو قەڵاتەوە
گەیی‌یە هەڵمەت‌و قوربانی.
من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم، تالێت فێربم
لەچرکەی سەرەمەرگیشا قەڵەم لەدەستما نەلەرزێ.
تالێت فێربم.. لەدوا کوژانەوەی عومرا
تیشکی پشکۆی زەردەخەنە بەلێومانەوە نەتەزێ.
سەد مخابن من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم
بەڵام "ڕەنجبەر".
لەباتی گشت شاعیرانی باژێرەکەم
لەباتی گشت شەهیدانی باژێرەکەم
چەپکە گوڵی باخچەیەکی برینی خۆی
کردە مەرکانی دڵتەوە.
سەد مخابن لەوێ نەبووم.
بەڵام، جوامێر"
لەباتی گشت شاعیرانی وڵاتەکەم
لەباتی گشت پێشمەرگە قەڵەمەکانی وڵاتەکەم
مەزاری گیانی ئەوینداری دایە بەر تاوە فرمێسك.
مامۆستام.. دڵنیا بنوو
هاوڕێکەم.. دڵنیا بنوو
ئەو پێنج مۆمە ئێستاکە، مۆمستانێکی قژ زەردن
من مۆمێکیانم.
ئەو پێنج درەختە ئێستاکە، دارستانێکە چاو سەوزن
من درەختێکیانم.
بنوو.. دڵنیا بنوو
سەیوان، سەیوانی شەهیدو شاعیرانە..
تۆ هەردووکیانی..
دڵنیا بنوو..
تۆ شەهیدێکی شاعیرو
تۆ شاعیرێکی شەهیدی..



# جەلالی میرزا کەریم
# شاعیرو شۆڕشگێڕی خاوەن هەڵوێست

لەکوێوە.. لەکام بناری عەشقەوە سەیری لوتکەی ئاواتە زیندوەکانت بکەم، کێ بەو عەشقەم ئاشنا دەکا کەخەمەکانی تۆی لەئامێز گرتووە، لەو ڕۆژەوە رۆحم ئاشنای خەمە سپیەکانتەو خۆشەویستیم لەسیماتا چرۆ دەکا، ئەی مرۆڤی برسی نان‌و تینوی ژیان کاتێ گڕ لە تەمەنم بەرئەدەم جگە لەتۆ کێ ئەتوانێ لەبەر تیشکی ئەو عەشقەدا خۆی راگرێ.

ئای مرۆڤی بڕواو هەڵوێست، کاتێ لەلوتکەوە سەیری بیرەوەریەکانم دەکەم هەرتۆیت‌و تۆ، پێم نەووتی ئامان ماڵی عەشقم نەڕمێنی. تۆ ڕۆیشتی‌و لەدووای خۆت کۆمەڵێ حەسرەتت بۆ جێهێشتم، نەگەڕایتەوە تابزانی لەدوای ئەو کۆچە بێ وادەیە، چۆن غوربەتی سەدەیەك ژان سەری خۆم‌و بیرەوەری‌و ئاواتەکانیشی سپی کردم.

لەم یادەدا بۆ ئەوەی ژیان‌و رابوردوی ئەو شاعیرە هێژایەمان بزانین پێویستە ئاوڕێك لە هەڵوێست‌و هەڵس‌و کەوت‌و ژیان‌و سەرهەڵدانی رابوردووی بنەماڵەکەی‌و بارودۆخی ئەو سەردەمە بدەینەوە، چونکە کوردواتەنی" کوڕ لەخۆیەوە پێ ناگات، بەتایبەت کەسێکی شاعیر قارچك‌و دوومەڵان نی‌یە بەزەبری هەورەگرمە هەڵتۆقێ.

جگە لەوە بنەماڵەکەمان دەگەڕێتەوە بۆ قەڵاچوالانی مەڵبەندی بابانەکان، لەگەڵ دروست کردنی شاری نوێ لەساڵی1784دا هاتوونەتە سلێمانی، باپیرەگەورەمان( خدر ئاغا) مزگەوتێکی لەسەرو مزگەوتی گەورەوە دروست کرد بەناوی( مزگەوتە بچکۆلە- ئێستا پێی ئەڵێن بن تەبەق)، واباو بووە هەر خانەوادەیەکی دەست ڕۆیشتوو هاتبێتە شار مزگەوتێکی دروست کردووە بۆ ئەوەی زیاتر ناو دەربکات. دیارە ریشەی بنەماڵەکەشمان دەوری گێڕاوە بۆ پێگەیاندنی رۆڵەی رۆشنبیرو تێکۆشەر.

جا باپیرمان( وەستا ئەحمەدی ناڵبەند) کەباوکی ناوی( عبدالله ئاغا) بووە. ئەو ئاغاکەی لەخۆی کردوەتەوەو تاگیانیشی دەرچووە لەسەر دەزگای ناڵبەندیەکەی هەربە( وەستا ئەحمەدی ناڵبەند)ەوە ناوبانگی دەرکردبوو، لەدوایدا فێری خوێندن‌و نوسین بوو لای( زێوەری شاعیر) کەخزممانە ناوەکەی بووبە( میرزا کەریم)و بووە خاوەنی مڵك‌و سامان‌و بازرگانی دەکرد.

بەپێویستی دەزانم لەباسی حیزب‌و دەریای سیاسەتەوە بگەڕێمەوە بۆ ساڵی1944 ئەو کاتەی بەهۆی رۆشنبیران‌و قوتابیانی( خوێندنی باڵا)وە کەلەبەغدا دەیانخوێند بیری مارکسی بڵاوبۆوەو دەست کرا بەرێکخستنی حیزب. ئەوکاتە من بەهۆی بەڕێز( ئەنوەری حەمە ئاغا)وە کەلەبەغدا قوتابی بوو، پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێ فەهد هەبوو بووم بەحیزبی لەدوایدا بەڕێز کەریم زەند کە لە( دار المعلمین) دەرچووبوو، بوو بەمامۆستاو گەڕایەوە بۆ سلێمانی‌و لەقوتابخانەی فەیصەلیە بوو بە مامۆستا، پاشان بوو بە رێکخەرمان لەقوتابخانەو لیژنەی بنەڕەتی دامەزرا بریتی بووین لە( من‌و ئەحمەدی دەروێش دادی- لەدووی ناوەندی بوو- لەگەڵ خەسرەوی کوێخا غەفوور کە کوڕە دەوڵەمەندێکی هەورامی بوو).

جالەبەر دەوڵەمەندی باوکم‌و سۆزی لەرادەبەدەری بەرامبەرمان، بوو بەپاڵپشت‌و ڕێگە خۆشکەرمان بۆ چوونە ناو کۆڕی تێکۆشانەوە، زیادەڕۆیی نی‌یە ئەگەر بڵێم بەکاڵەوپێتاوەوە بووین بەپێشەنگی تێکۆشەران لەسلێمانی. لەو زەمانەش دا هەرکەسێ دەبووە هەڵگری بیرو باوەڕێك‌و ئەچووە ناو دڵ‌و مێشك دەرونیەوە، باوك‌و دایك‌و خزم‌و ناسیاوی هەمووبە سۆزەوە دوای ئەکەوتن بێ ئەوەی بیر لەئەنجامەکەی بکەنەوە. دوور نەڕۆین کەسایەتیەکی وەکو بەڕێز( مەحمودی فەقێ محەمەدی هەمەوەند) کەکەڵەپیاوێکی تێکۆشەرو ڕۆشنبیر بوو بیری مارکسی وەرگرت‌و زۆر لە عەشرەتەکەی بوونە دۆست‌و لایەنگرمان، یا کەسایەتیەکی وەکو بەڕێز( تۆفیق قەزاز) کەپیاوێکی ئازاو کورد پەروەر بوو، لەساڵی 1964 لەنزیك محەلەکەیەوە( کتێب خانەی بیری نوێ)مان دامەزراند ئەو بەڕێزە کرێی دوکانەکەی بۆ ئەداین. بەرەی شێخانیش بەهۆی( شێخ لەتیف)ەوە کەلە پەنجاکانەوە دۆستمان بوو بەرەی شیخانیش هەمان هەڵوێستی ئەویان گرتە بەر، ئەمە جگە لە پیاوانی دینی‌و ناوداری سلێمانی. بەتایبەتی ئەوسا بزوتنەوەی مارکسی دروشمێکی بەرزکردبۆوە کە بریتی بوو لە (وطن حر و شعب سعيد) واتا نیشتمانێکی سەربەست و میللەتێکی بەختیار بریتی بوو لەدروشمێکی نیشتمانی نەك چینایەتی، بۆیە کۆمەلأنی خەڵك بەعەشقەوە ئەهاتن بەرەوپیری. لەو کاتەشدا حیزبی تر نەبوو پێشبڕکێ‌ی لەگەڵ بکات، بۆشاییەکی زۆر هەبوو کوڕانی تازە کورە پڕیان کردەوە، (حیزبی هیوا)ش لەو کاتەدا چالاکیەکی ئەوتۆی نەبوو شایانی باسکردن بێت. هەروەها بارودۆخی جیهان‌و سەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت‌و هاتنی لەشکرەکەی بۆ مهاباد‌و دامەزراندنی کۆماری کوردستان بوونە یارمەتی دەرمان بۆ چوونە ناو جوڵانەوەی سیاسیەوەو برەودان بەچالاکیمان. لێرەدا مەبەستمان لەرایەڵەی ئەم باسە ئەوەیە کەدەوری بنەماڵە گرنگ‌و گەورەیە لەپێگەیاندنی ڕۆڵەکانیان، بەتایبەت ئەگەر کوڕە گەورە ڕێ‌و شوێنێکی تایبەت هەڵگرێ براو کەسەکانیشی شوێن پێ‌ی هەڵئەگرن‌و لەدوایەوە ئەڕۆن. ( جەلال)ی برام لەدایك بووی ساڵی ( 1935)ە، کاتێ ئێمە لەچلەکاندا هاتینە کۆڕی سیاسەتەوە ئەو منداڵ بوو لەگەڵ( مالیك)ی مامم شیریان خواردبوو، هەر لەسەرەتاوەبە هەڵس‌و کەوتی لەسەرخۆیی‌و بیرکردنەوەی قوڵ ماکی شاعیریەتی لێ دەرکەوت بەدەم ئەرك‌و پێویستی‌و فرمانەکانی ئێمەوە بوو، لەو زەمانەش دا برای بچوك مل کەچی فەرمانەکانی براگەورە بوو هەر لەسەرەتاوە فێرمان کرد بخوێنێتەوەو لەکۆڕی ئەو برادەرانەی کەئەهاتنە ماڵمان دابنیشێ‌و گوێ بگرێ. ئەوەندە هۆگری ڕۆشنبیری بوو( مالیك)ی مامم( کەهەموو لەماڵێك دا بووین) فێری خوێندنەوەو نوسین بکات( چونکە بەزکماك کەڕولاڵە، دەورێکی سەرەکی گێڕا لە ژیانیا بۆ هێنانی بۆ کۆڕی تێکۆشان( تائێستاش مالیك هەر لەحیزبایەو وازی لێ ناهێنێ هەرچەندە لەرابوردوودا ناحەزان زۆریان ئازاردا، هەتا جارێکیش ئیستخباراتی ڕژێم فڕاندیان بەدزیەوە، بەهەزار فەلاکەت‌و واستە دۆزیمانەوەو لەمردن رزگارمان کرد).

هەر لەسەرەتای منالیەوە بەفەرمانی حیزبی (جەلال)مان ئەنارد بۆ ماڵی برادەران‌و بەندیخانەو نەخۆشخانەو جێگای تر بۆ پەیوەندی کردن‌و کتێب هێنان لای برادەران. کاتێ لەبەندیخانەی سلێمانی بەندبووم (گۆران)ی شاعیریشمان لەگەڵ بوو جەلال هات بۆلامان. لەدوایدا بەهۆی باری سیاسی‌و فکریەوە ماڵمان جمەی ئەهات لەڕۆشنبیران‌و شاعیرانی وەکو (گۆران‌و ئەحمەد هەردی‌و حەمە صالح دیلان‌و کەسانی تر، ئەو بارودۆخە دەوری تایبەتیان گێڕا بۆ مێشك کردنەوەو تەقینەوەی بیرو شاعیریەتی جەلال. ئەوەی لەبیرم بێ کاتێ من ڕاکردوو بووم لەبارەگای شێخ لەتیف لەسیتەك، لەساڵی 1954 عومەر عەلی کرا بەمتصرفی سلێمانی بۆ سەرکوت کردنی جوڵانەوەی نیشتمانی‌و شیوعیەت، جەلال لەوێش یەکێ بوو لەئەندامە چالاك‌و بزێوەکان..

هەر لەو کاتەدا عومەر عەلی باوکیشمی گرت‌و ئازارێکی زۆری‌دا تاوای لێهات هەموو دەم‌و لوتی پڕکرد لەخوێن‌و شەش مانگ حوکمی‌دا لەگەڵ ئەوە ماڵەکەمانیان داگیر کردو دایکم‌و خوشکەکانمانیان دەرکردو ماڵەکەیان کرد بەبنکەی پۆلیسی سەرشەقام.

چەند گەنجێکی گەڕەکی سەرشەقامی ئەو سەردەمە وەکو (نایب عبداللە- حەمەی فەتاحی کەریمی لەیلێ- خاڵە حەمە (حەمەی عەزەدۆم)و چەندین برادەری تر لە ساڵی 1949دا پەیوەندیان بەحیزبەوە کردو دەورێکی بالأیان هەبوو بەتایبەتی (جەلال) کەلەیەکێتی قوتابیان دا دەورێکی بەرچاوی بینی ئەویش بەدامەزراندنی (ڕێکخراوی بێچوە شێران)ی حیزب بوو کەهۆکەی بیرو بۆچوونی ئەوبوو، ئەو قوتابیانەی گرتبووە خۆی کەلەقۆناغی سەرەتایی‌دا بوون‌و تەمەنیان نەگەیشتبووە ئەو ڕادەیەی ببنە ئەندامی حیزب یایەکێتی قوتابیان‌و پاشان تەسلیم بەبەڕێز (حەمە کاکە) کرا.

یەکەمین کەسیش بوو لەگەڵ کاك (حسین عارف)ی چیرۆك نوس دا نابیناکانی کۆکردەوەو کۆمەڵەیەکی لێ دروست کردن بەناوی (کۆمەڵی نابینایان) بۆ خوێندنی (خەتی برایل)، ئەو لەساڵی پەنجاکان دا لەهەموو چالاکیەکی قوتابیان‌و جەماوەریدا دەوری بالأی بینی‌و بەو هۆیەوە چەندین جار ڕاپێچی بەندیخانە کراو ئازاریان داوە.

لەڕۆژی دانیشتنی فەیصەلی دووەم ساڵی 1953، لەسلێمانی ئاهەنگێکی گەورە گەورەیان گێڕا، یەکەم کەس بوو لەگەڵ بەڕێزان (ئەحمەد عەباس- سەلامی مەلا سابیر- جەلال ئەورەحمان)و چەندانی تر دەوریان هەبوو بۆ تێکدانی ئاهەنگەکەو دڕاندن‌و شکاندنی دەهۆڵ‌و زوڕنای لۆتیەکان.لەگەڵ ئەوەش کەبیرو بۆچونێکی پێشکەوتوخوازو مۆدێرنی هەبوو، کوڕێکی ئازاو چالاك‌و شۆڕشگێڕیش بوو بەواتای ووشە کەتوانیان لەساڵی 1952دا بێ‌ڕا لەسەر بوونی حیزب لەگەڵ بەڕێز (سەلامی مەلا سابیر) قومبەلەیەك بخەنە ناو سەراوە.

لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی 1954دا دەورێکی بالأی هەبوو لەخۆپیشاندانەکانداو لەهێنانەوەی تەرمەکەی (شێخ مەحمود)ی نەمردا لەساڵی 1956 یەکێ بوو لەسەرکردەکانی خۆپیشاندانەکە لەگەڵ بەڕێزان (جەزای میرزا حسەین‌و کەریمی عەبە چنگیانی‌و ئەنوەر عوسمان‌و حسە ڕەشی خەیات‌و عەبدولی سوران‌و حسین عارف)و گەلێکی تر کەدەوری بالأیان بینی لەهەژانی جەماوەرەکەدا، کەئەمە بووە هۆی دەست کردنەوەی ڕژێم‌و کوشتن‌و بریندارکردنی زۆر لەبرادەران‌و گرتنی سەدان کەس‌و ڕاپێچ کردنیان بۆ بەندیخانەکان.

دیسان لە مەحکەمەدا جەلال دەورێکی بالأی بینی بەوەی کەبەر پەرچی حاکمەکانی دایەوەو وتی بەشاهێدی ئەو شاهێدانە قایل نین بەتایبەتی (فلأن) کەبەدڕەوشتە! ئەمە دەورێکی پاڵەوانانەی ئەوبوو لەمەحکەمەداو بووە هۆی حوکمی سێ مانگ‌و ساڵێك چاودێری لە (بەدرە)و ئەو ساڵەش بووە هۆی ڕسکانی شیعری‌و پاشان لەگەڵ هێژایان (گۆران‌و ئەحمەد غەفورو حەمەی مەلا کەریم‌و حیلمی عەلی شەریف‌و کامەران موکری) یەکیان گرتەوە، بێجگە لەگەلێ لە شاعیرو چیرۆك نوس‌و ڕۆشنبیری عەرەب.

لە14ی تەموزی (1958)یشەوە بووە ئەندامی لیژنەی محەلی حیزبی شیوعی، لەو دەمەدا کتێبێکی (لیشاوشی)مان لەعەرەبیەوە بەناوی (چۆن ئەبی بەتێکۆشەرێکی باش) گۆڕیە سەر زمانی کوردی‌و بەناوی (ج. ك)ەوە حەوت هەزار نوسخەمان لێ چاپ‌و بلأوکردەوە. لەساڵی 1962 لەگەڵ کۆمەڵێ ڕۆشنبیری کورد لەسلێمانی گیرا لەسەر شۆڕشی ئەیلول‌و ڕەوانەی (حلە) کرا تاکودەتای 1963. لەدوایدا کەبەربوو چووە بەغداو لەڕۆژنامەی برایەتی‌و هاوکاری‌دا کاری کرد تا لەساڵی 1970 بوو بەبەرپرسی دەرکردنی (گۆڤاری بەیان) کەلەو سەردەمەدا نایابترین گۆڤار بوو. زۆر یارمەتی شاعیران‌و

نوسەرانی کوردی ئەداو ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لەدەرکردنی گۆڤاری (کادر)ی ئەو سەردەمەی پارتی و چەندین ووتاری نووسیوە لەسەر سەربەخۆیی کوردستان. لەساڵی 1974- 1975دا کەشۆڕش دەستی پێ کردەوە، یەکێك بوو لەوانەی لەئەدەبیات و ئیزگەی ئەو سەردەمەدا کاری کرد تانسکۆ. پاش نسکۆ بەرەو هەندەران ڕۆیشت.

لەو ماوەیەدا ڕژێم زۆر هەوڵیدا کەبگەڕێتەوە چی دەوێ بۆی بکەن، بەلام ئەو ئازایانە لەسەر هەڵوێستی مەبدەئی و شۆڕشگێڕانەی خۆی ڕەتی کردەوەو تاڕاپەڕین نەگەڕایەوە.

چەند مانگێ دوای ڕۆیشتنی بۆ هەندەران هەڵبەستێکی نوسیوە کەلەبەر چی ڕۆیشتووە، هەرچەندە لەوێش لەهەموو خۆپیشاندان و چالاکیەکانی کورددا بەرامبەر ڕژێم لەسەر ئەنفال و کیمیاوی کوردستان دەوری بەرچاوو باڵای بینی بەدانانی شیعرو ئامادەبوونی لەهەموو کۆڕو کۆمەڵ و کۆبونەوەکاندا بەخوێندنەوەی ووتار لەگەڵ ئێش و ئازارێکی زۆر بەهۆی لێدانی سەیارەوە بەخۆی و گۆچانەکەیەوە لەبەرچاو بوو. ماڵەکەشی جێگەی (هاڤرکی- مناقەشە)و حەوانەوەی گەورە سیاسیانی کورد بوو، هەرچەندە بەڕێز دکتۆر نجم الدین ڕێزی زۆری لێ دەگرت و دکتۆری تایبەتیشی بوو، وەك دۆست و هاوڕێی نزیك و خۆشەویستی هەردەم چاودێری دەکردو ئاگاداری بوو.

لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستی و وەفای بۆ بنەماڵەکەی کە (شێرکۆ)ی برازام لەساڵی 1991دا لەسلێمانی شەهید کرا، لەوێوە دەورێکی مەردانەی بینی بۆ ڕسواو مەحکوم کردنی ڕژێم لەو تاوانەی بەدانانی قەصیدەیەکی درێژو بۆی ناردینەوە بۆ سلێمانی و لەلایەن خۆمانەوە جارێکی دیکە چاپ و بڵاومان کردەوە لەناو خەڵکیدا دەنگێکی گەورەی دایەوە.

هەر لەسەر ئەو هەڵبەستەی کەتیایدا دەڵێ. چۆن چووم بۆ هەندەران، وورە بەرزی و هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەو شاعیرانەی خۆی چەسپاندووە، بەوەی کەدەبێ ڕۆژێك ئازادانە بگەڕێتەوە کوردستانەکەی: بەڵێنەکەی وەك کورد، وەك مرۆڤ، وەك شاعیر بردە سەرو دوای ڕاپەڕین گەڕایەوەو بڕیاریدا جارێکی دی ملی ڕێی هەندەران نەگرێتەوە، کەگەڕاشەوە پەیوەندی بەهەموو لایەن و ڕۆشنبیران و کەسێتیە سیاسیەکانی ناو وولاتەوە کردو بڕیاری دابوو وەك شاعیرێك بێ لایەنانە کار تەنها بۆ کورد بکات هەرچەندە حیزبی شیوعی زۆر ئیجابیانە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکرد.

لەدوایدا چەند کۆڕێکی بۆ شیعرو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی گرت و پاشان بوو بەیەکێ لەدەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)و دەوری بەرچاوی بینی لەسەرخستن و پێشخستنی و بەرگێکی نوێشی کرد بەبەریدا. جگەلەوەی ڕۆژانە خەریکی ئیشە تایبەتیەکەی خۆی بوو کەبەرپرسی (ڕادیۆی هەرێمی کوردستان)ی ئەو کاتە بوو. بەو توانا مادیەکەمەوە توانی بەشێکی شیعرەکانی بەناوی (ڕێگا دورەکانی چاومان) لەسەر ئەرکی خۆی چاپ بکات.




بەلام بەداخەوە لە 13/ 1/ 1993 مەرگێکی ڕموزن دەستی لەدڵە گەورەکەی (جەلال)ی شاعیرو کورد پەروەرو مرۆڤ دۆست گیر کردو لەهەولێر کۆچی دوایی کردو تەرمە پیرۆزەکەیمان هێنایەوە بۆ شارەکەی مەلیك مەحمودو لەگردی سەیوان لەئامێزی ئەرخەوانە خوێناویەکاندا چاوی ئارامی لێك ناو ماڵئاوایی لەکوردستان و بنەماڵەو دۆست و هاوڕێکانی کردو هەموو حیزب و لایەن و کەسایەتیە ناسراوەکان و جەماوەرێکی زۆر هاوبەش بوون لەبەخاك سپاردنیدا، بەتایبەتی هاوڕێیانی حیزبی شیوعی کوردستان.

لەپاشان لەسلێمانی و لەهۆڵی ڕۆشنبیری چلەیەکی شایستەی بۆ گیرا لەگەڵ کردنەوەی پێشانگایەکی تایبەت بەشیعرەکانی، کەهەر شیعرەو تابلۆیەکی تایبەتی گرتبووە خۆی لەلایەن (ئاری قادر)ی برازامەوە کەبووە هۆی سەرنج ڕاکێشانی ئەوانەی هاوبەشیان کرد.

لەکۆتاییدا دەڵێین ساخوات لەگەڵ شاعیرە قەڵەم سەربەرزەکە، سەری ڕێزو نەوازشی کوردانەمان لەم بۆنەیەدا دادەنەوێنین بۆتۆی براوشاعیرو هەموو ئەو شاعیرو نوسەرە بەهەڵوێستانەی لەناوماندا نەماون لەگەڵ سەرجەم شەهیدانی ڕێی ئازادی کورد.

لەجیاتی بنەماڵە

غەفوری میرزا کەریم

## نامە

**دەقی نامەیەکی جەلالی میرزا کـەریم کـە لـە ڕۆژی 1991/12/12 بـۆ (ئاسـۆ)ی بـرازای نـاردووەو بـاس لـە کارەسـاتی ئـەنفال و کیمیـا بـاران و خاپوورکردنی گوندو دیهاتەکانی کوردستان دەکـاتو، داوای لێدەکـات لـەو ڕووەوە زانیاری تەواو کۆکاتەوە.**

بۆ ئاسۆ گیان

تێر تێر ماچت ئەکەم و ئەمەندە بیرتان ئەکەم، مەگەر ژان و تالاوی ئەم هەژدە ساڵەی دوورە ئێوە.. دوورە کورستان لێم ڕاپەڕن و دەست بەنە یەخەم و بەسەرما بنەڕێنن و هاوار بکەن: بگەڕێرەوە!. هیوادارم و هەر وایش بڕیارە لە نەورۆزی داهاتوودا و لە یادی ڕاپەڕینەکەی کوردستاندا لەگەڵ کاک حەیدەردا لەناوتانا بین. هەواڵی شەهید بوونی شێرکۆ گیان، جارێکیتر گریانمی.. نەء هەژانمی؛ ئەڵێم جارێکیتر چونکە شەهیدبوونی هەزاران شێرکۆی تر گریانومی و هەژانوومی. چاوی ئاکۆ و ئامانج ماچ ئەکەم کە لەگەڵتانەو سڵاوم بۆ هەموان. کاک حەیدەر پێی ووتم گوایە ئەیانەوێت دیمەنی وێرانەیی و ژیانی خەڵکی ئاوارە بگرن و پرسیاریش ئاڕاستەی هەندێ کەس بکەن و بیکەنە ڤیدیۆ، منیش لەو ڕووەوە یارمەتیتان بدەم و چەند پرسیارێك پێشنیار بکەم کە ئاڕاستەی خەڵکەکە بکرێت. ئەم کارە زۆر پیرۆزو سوودبەخشە، بەڵام زیاتر بە کەسانێك ئەنجام ئەدرێت کە لە واقیعی کارەساتەکەدابن و لە لێهاتوویی هونەریەوە وەکوو ئاکۆ بن. بە هەرحاڵ من ئەم چەند سەرنج و پێشنیار و پرسیارە ئەنووسم بە ئومێدی بەشداربوونێکی زۆر کەمم لەو هەوڵەتانا.

–زۆرتر وێنەی ئەو شارو جێگایانە بگرن کە بەرلێدانی کیمیاوی ڕژێم کەوتن، وەك هەڵەبجەو بادینان شێخ وەسان و بالیسان.. هتد. گرنگ کە ئەو شوێنانە خەڵکی تێدابێت بەڵام با خودی ئەو شوێنانەنەبن، لەگەڵ مۆسیقایەکی خەمناکدا شیعر یان تەعلیقی تایبەت بەو دیمەنانە بوترێت.

–ئینجا چاوکەوتن بە خەڵکی ئەو شوێنانە.. لە هەر کوێیەك بن.. زیاتر لەگەڵ ژن و مناڵ و پیردا بێت و پرسیارەکانیش هەمان پرسیار نەبێت وەکو یەك لە چەند کەسێکی جیاواز بکرێت بەڵکو شێوەی گفتوگۆیەکی ئاسایی ناو کەسەکان بێت و دوور بێت لەوەی میکرۆفۆن جاریَ بەدەست ئەو کەسەوە بێت کە پرسیار ئەکات و ئینجا بەدەست ئەوەی وەرام ئەداتەوە و چاوی کامێرایش هەر خەریکی ئەمبەرو ئەوبەربێت. لەم ڕووەوە پرسیار زۆرن.. گرنگ ئەوەیە وەرامەکان قەفەسی قفڵدراویان ئەکەنەوە؟ بەڵێ ئەیکنەوەو چاکیشی ئەکنەوە، ئەگەر کلیل لە دەستیانا بێت. پوختەی پرسیاری گەورە: ئێمە چین و چیمان ئەویَ؟؟.

–گەر بتانەویَ وەرامێکی مەزنتان بەرگویَ کەوێت؟ پرسیارێکی ساکار بکەن.. ئەبێ پرسیارەکەیش لە کەسانی ساکاری بکەن..

تەنیا بۆ تاقیکردنەوە با ئەم نمونەی پرسیارو وەرامانە یادداشت بکەین:

پ–ئێرە کوێیە؟

و–ماڵی تۆیە..

پ–ناونیشانت؟..

و–نەخشەم پێیە.

پ–بۆ کویَ ئەڕۆیت؟

و–بەرەو هیوایەکی دوور...

ئەشتوانن بپرسن: لە جۆری ژیانیان پێش کارەساتەکە.. چەند نموونەیەك لەو بەسەرهاتانە.. دوای کارەسات کەوتنە کویَ و جۆری ژیانیان.. هتد.

ئەتوانن ئەو بەشەی سەرەوە بکەنە بەشی یەکەمی تایبەت بۆ هێرشی کیمیاوی، بەشی دوویش بۆ ڕاپەڕینەکەی ئازار.

بۆ ڕاپەڕینەکە وەك ڕیپۆرتاژێك بەوێنەوە، ئەگەر هەبێت وێنەی زیندووی ڕاپەڕینەکە پێشکەش بکەن.. مقابەلە لەگەڵ ئەوانەدا بەشداری فیعلی یان لە پێکهێنان و پێشڕەوییدا کردوە.. هەروەها خەڵکی تریش.. دەسکەوتەکانی ڕاپەڕینەکەو هۆیەکانی سەرنەکەوتنی... هتد.

دەربارەی مفاوەزات بیروڕای خەڵکی چییە..؟.

بە فراوانی باسی دەربەدەر بوونی خەڵکەکە بکرێت بۆ ئێران و تورکیا و شوێنەکانی تر بە مقابەلات و نیشاندانی وێنەو دیمەنی زیندوو.. جۆری ژیانیان و وەزعی ئێستای شارەکان لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە.. هەرچی شتێکی تر کە خۆتان بە باشی بزانن. لەسەرتاپای ئەو باسانەدا دەوری بەرەی کوردستانی لەیاد مەکەن.

**سەرکەوتنتان هیوامەو هەر بژین..**

**مامت**

**جەلال** 12-12-1991



- من گەردنی ئاسۆی شاری پڕ هەنسکە
خۆم ماچ ئەکەم
« بزەی نەرمی شەپۆلی دوو لێوی وەڵام
لەبەر دەم دەرگای گریانا
ئەبوە ئەنجام
ئەبوە پەیام »
- من ڕەشماڵی خێڵی شۆڕش
لەناو شاری کۆچەرانا
لەناو وەرزی بیابانا
لەناو دڵتانا هەڵئەدەم

« چاوی ژیان
دەرگای داستان
لە پرسیاری باڵای لە خوێن هەڵکێشراوی
شۆڕە سوارێک کرایەوە » .
- ناوت نابەم
خۆت هەشاردە .. دوژمندارێت
باست ناکەم
برینداریت .
« ئەوانی زامی .. بێدەنگ ئەبوی هێشتا بە سوێ
چاوی ماڵی
نیگای کاڵی
... پڕ کرد لە خوێ

من مەرگی پێشمەرگەی زیندووم
من گۆرانی ئاسۆی چاوم
من ئازاری ئازادی ناوم
من ؟! هۆنراوەم
بەبێ سەنگەر هەرگیز ناژی .
من ؟! سەنگەرم
بەبێ دەفتەر هەرگیز ناژی .
من .. لە مەرگا
ناوی ژیان لە خۆم ئەنێم
من .. لە دەنگا
شیعر بۆ چرپەی چاو ئەڵێم
من لە تۆمی خوێنی هەڵسانی ڕێگای شارا
هەنگاو ئەنێم
من چارۆگەی کەشتی باخی
هەڵچوونی ژینم .
« شۆڕە سواری ..
بۆ پرسیاری ..
تاوی ئەدا .. باڵی ڕۆژگار
ڕاوی ئەنا .. هەوری شەرگار
هەرە ڵاوێ .. لە بوە هاوار
ئەبوە سوێندی گەردن ئەکا تار »



**بەغداد – باخچەی هۆڵی (خالد)** 1970/6/23
**لە چەپەوە بۆ ڕاست: عەتا قەزاز – کاکە مەم بۆتانی- کمال رووف- حسین عارف-**
**شێرکۆ بێکەس- عبداللە پەشێو- جمال شارباژێڕی- جەلالی میرزا کەریم-عبداللە عباس**



**ریزی ناوەراست:**

**سەلاح شوان، حەسەن گەرمیانی، جەلال میرزا کەریم، حسین عارف، مستەفا رابەر**



**لە راستەوە**

**حەمید عەزیز، جەمال موفتی، سەلاح شوان، حسێن عارف، جەلال میرزا کەریم، بەدرخان سندی، عەبدوڵڵا عەباس،..**



**جەلال میرزا کەریم لە گەڵ محمد مفتاح فەیتوری (شاعیری سودانی) لە بەغدا**



**گەلاڵە** .. 1974

**ئەنوەر قادر محمد، شێرکۆ بێکەس، فاروق مەلا مستەفا، کاکەمەم بۆتانی، سامی شۆڕش، سەلاح شوان، جەلال میرزا کەریم (بەپێوە).**

# ئاگادارییەك لە دەزگای سەردەمەوە

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەنیازە لە زنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بە وەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لە زمانە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

**یەکەم:** بایەخی تایبەت بە لێکۆڵینەوە دەدرێ لە بوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەقی جیهانی وەرگێڕراو، رەخنە، زانستە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسیەکان، تۆژینەوەی هونەریی، ئەدەبی منالأن، فەرهەنگسازی...دا.

**دووەم:** دەبێ دانەیەك لە کتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

**سێیەم:** دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ وەردەگرێتو پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەو لاپەڕەکانی کتێبەکە (جگە لە رێژەیەك لە کتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

**چوارەم:** هەر دەسنووسێکی هاتوو بە خەتێکی جوان نەنووسرابێتەوەو ئەو مەرجانەی سەرەوەی تێدا نەبێت، فەرامۆشدەکرێ.

**پێنجەم:** مافی لەچاپدانەوەی چاپکراوەکانمان بۆ دەزگای چاپو پەخشی سەردەم پارێزراوە.